| | |
|---|---|
| ٢ . ئاست (عاست)؛ بەرامبەر؛ حاست؛ تەراز؛ هەمبەر؛ ڤەراڤەر؛ پەرپۆز؛ ڕوویەڕوو. | 2 . Opposite, facing, overagainst, fronting, parallel with, equidistant through about, abreast concurrent. adj.; adv. |
| ٣ . سنوور؛ سیلە؛ کەرخ؛ کووج؛ قەمترە؛ چیلە؛ شوورە. | 3 . Boundary, frontier, limit, border, confine, march, bourn, bound, periphery, circuit; termination, circumference. n. |
| ٤ . کەنار؛ وەراوەر؛ وەرانوەر؛ شان بە شان. | 4 . Edge, rim, hem, brink, bordure, shoulder to shoulder, neck to neck, neck and neck, side by side; n. |

| | |
|---|---|
| **(لە) ئاڤاری. . . (ف)** | * |
| ١ . ڕوویەڕووی. . . ؛ بەرامبەر بە. . . | 1 . In (the) face of...; in the presence of; phr. |
| ٢ . لە سنووری. . . ؛ لە سیلەی؛ لە کەناری؛ لە شانی. . | 2 . Borden on, border upon, next to, almost be, like (for comparison); phr. |

| | |
|---|---|
| **ئاڤشقە (ن)** | * |
| دوو دەریی. | Room window, two french windows; n. |

| | |
|---|---|
| **ئاڤڵ (ن/ئان)** | * |
| ١ . هۆش؛ ئاریش؛ بیر؛ فام؛ ژیریی. | 1 . Sagacity, sense, sentiment, comprehension, understaning, intellectual, faculties; n. |
| ٢ . ئەقڵ؛ عەقڵ؛ فڕ؛ منە. | 2 . Mind, reason, intelligence, knowledge, brains, thinking principle, intellectual powers; n. |
| ٣ . عاقڵ؛ ووشیار؛ هوشیار؛ ژیر؛ هیردار؛ ژیرلۆ؛ زیرەك؛ تێگە یشتوو. | 3 . Intelligent, wise, initiated, conscious, sentient, percipient, aware, cognizant, rational, clever, sensible, competent; adj. |
| ٤ . بێدەنگ؛ بێهەست و خوست؛ بێ قرە و برە؛ لە سەر خۆ. | 4 . Silent, calm, taciturn, reticent, tranquil, serene; adj. |

| | |
|---|---|
| **ئاڤڵ بڕین (کتن)** | * |
| ئەقڵ بڕین؛ ئەقڵ گرتن؛ سەلماندن. | Believe, apprehend, conceive, take it, have faith, have a firm persuasion, be of opinion; entertain the idea; vi. |

**ئاقڵ کردن** (کـتپ)

١ . تمێ کردن؛ ئامۆژگاری کردن.

٢ . داین کردن (منداڵ)؛ هێمن کردنەوە؛ هێدی کردن.

*

1 . Instruct, admonish, apprise, notify, forewarn, make aware, make aquainted; vt.

2 . Lull (a child), put to rest, tranquillize, compose; vt.

**ئاقید** (ن)

گوومەز؛ گومبەز؛ گومەز؛ گومبەت؛ ئاقد.

*

Dome, cupola, tholus, spherical - vaulted roof; n.

**ئاقـیـد** (ن)

دۆشاوی خەست (بە تایبەتی دۆشاوی ترێ).

*

Concentrated syrup (esp. of grapes); n.

**ئاقـیـق** (ن)

١ . عـاقیق؛ عەقیق؛ یـاقیق؛ بەردێکی سووری بە نرخی تررووسکەداری شوو شەیی رەقە.

٢ . سووری تۆخ (رەنگ)

*

1 . Garnet, agate, a hard deep red gem (esp. glass - like and of transparent red); n.

2 . Deep red (colour); n.

**ئاقیقی یەمەنی** (نل)

بەردی سلێمانی؛ بەردی سلێمان؛ یاقیقی یە ـ مەنی؛ جۆرە یاقیقێکە وەك بەردێکی نیمچە بەنرخ بـەکار ئـەهێنرێ (بـەتایبـەتی بۆ نەخش لەسەر هەڵکەندن).

*

Onyx, a variety of agate used as a semiprecious stone (esp. in making cameos); c.n.

**ئاقـیـلە** (ن)

تیروئاموور؛ ئاقیلەوماقیلە؛ کەرەستـەی جووتی.

*

Plough, plow, ridge plough; n.

**ئاکار** (ن)

خـوو؛ نـەریت؛ رەوشت؛ کــردەوە؛ سەرڕشتە.

*

Behaviour, manner, tendency, disposition, proneness, proclivity, deed; n.

**ئاکام (ن)**
١ . کۆتایی؛ دووما؛ دووماهکی؛ دوایی و ئەنجامی هەرشتێ.
٢ . سەرە مەرگ؛ دواگیان؛ گڵ؛ مەرگ؛ ڕێی هەموان؛ کۆچی دوایی؛ دواهەناسەی ژیان؛ گیانەڵا؛ قەیران.
٣ . نەگبەتی؛ ناهەمواری، چارە ڕەشی.

*
1 . End, finale, finish, ending, last, conclusion, completion, final state; n.
2 . Death - distress, end of life, dissolution, departure, the pangs of death, agonizing struggle; way of all the flesh, debt of nature, throes.
3 . misfortune, hardship, reverse.

**ئاگا (ن/ئان)**
١ . ئاگاه؛ هەواڵ؛ باس؛ باسوخواس؛ خواس؛ دەنگ؛ دەنگوباس.
٢ . جاڕ؛ بانگەواز.
٣ . تازەباو؛ تازەداتاشراو؛ تازەداهاتوو؛ شتی نوێ؛ تەرزەنوو؛ تەرزە نوێ.
٤ . وەڵام؛ وەرام.
٥ . گموا؛ بینا؛ ووشیار؛ خەبەردار.

*
1 . Tidings, news, information, report, word, recent accounts; n.; adj.
2 . Call, outcry, cry, voice, summons, announcement; n.
3 . New fashion, newly embroidered (garment), new case (of law), newly invented, modern, , adj.
4 . Answer, reply, response, counter - statement; n.
5 . Aware, mindful, conscious, observant; adj.

**(بە) ئاگا (ف)**
١ . وەئاگا؛ بەخەبەر؛ وەخەبەر (لەشتێ).
٢ . بێدار؛ ئارین؛ وریا؛ ووشیار؛ هوشیار؛ شییت (ئان).

*
1 . Au courant, remember, well informed, conversant with; phr.
2 . Wide awake, attentive, vigilant, watchful, on the alert; adj.

**ئاگابوونەوە (کتن)**
(بە) خەبەر بوونەوە؛ بێدار بوونەوە (لە خەو)؛ لە خەوهەڵسان؛ ڕابوون؛ ڕاستبوونەوە.

*
Wake up, awake, waken, be roused from sleep, cease from sleep; vi.

**ئاگادار (ئان)**
١ . بەئاگا؛ کارزان؛ بریف؛ پێزان؛ ووشیار؛ هوشیار.
٢ . زانا؛ دانا؛ شارمزا؛ لێ زان؛ تێ گەیشتوو.

*
1 . Cognizant, apprised, sensible, percipient, expert, proficient, adroit, dexterous; adj.
2 . Mindful, persuaded, learned, scholar; adj.

| | |
|---|---|
| ٣ . پارێزەر؛ پاراژۆ؛ چاودێر؛ چاودێریکەر؛ نەیرڤان؛ نقادا؛ واژەر. | 3 . Protecter, guardian, observer, supervisor, beholder, by - stander, on - looker, looker - on; adj. |

**ئاگادار بوون (کتن)** ✱

ئاگا لێ بوون؛ ئاگا لێ هەبوون؛ پێ زانین.

Be aware of, be sure of, be assured of, know about, be certain, see through, make out; vi.

**ئاگاداربە! (ئسب)** ✱

ووشیار بە!؛ ئاگات لە خۆت بێ؛ ئاها!؛ ئەها!؛ ئەی!.

Be careful!, look out!, pay attention to, heed to, Be aware of!; A - ha!, Ay!; interj.

**ئاگادار کردن (کتپ)** ✱

١ . پێ ڕاگەیاندن؛ تێ گەیاندن؛ حاڵی کردن؛ ئامۆژگاری کردن؛ وەلامدان؛ ڕانان؛ لیەرکەتن؛ دانەزانین؛ سەرنج ڕاکێشان؛ بە گوێ هەهێنان؛ پێ گوتن؛ پێ ووتن؛ بۆ ڕوون کردنەوە؛ پەیرەو کردن؛ بۆ نووسین.

1 . Inform, enlighten, instruct, notify, tell, warn, discipline, make clear, bring under subjection, speak to, say to, bring up, make known to, mention to, give notice to, signify to, send word to, write word to; vt.

٢ . هاندان؛ پاڵ پێوەنان.

2 . Animate, inspire, quicken; vt.

**ئاگادار کردنەوە (کتپ)** ✱

١ . دەنگدان.

1 . Exhort to take heed; vt.

٢ . ووشیار کردنەوە؛ وریا کردنەوە.

2 . Rouse, raise, awaken, wake, waken, warn, put in commotion, caution against danger, sound the alarm; vt.

٣ . قراندن؛ نوقلانە لێدان (بە خراپە).

3 . Foretell mischance, predict reverse, prophesy hardship; vt.

**ئاگاداریی (ن/نچ)** ✱

١ . ئاگاهیی؛ ئاگایی؛ خەبەرداریی.

1 . Perception, observance, apprehension, deem, act of watch and ward; n.

٢ . بێداریی؛ پارێزگاریی؛ ووشیاریی؛ چاودێریی؛ سەرپەرشتیی؛ کاری چاوتێوەبوون. (نچ)

2 . Watchfulness, keeping, attention, supervision, vigilance, attentiveness, awakening, directing the eye, turning the thought. infin. n.

٣ . بینایی؛ کارناشنایی؛ کارزانیی؛ سەلیقە.

3 . Vision, sight, efficiency, sagacity, natural disposition, experimental knowledge, knowledge gained from observasion, long practise; n.

٤ . چەوتوچییلە؛ کاری لێوورد بوونەوە.

4 . Overhauling, scrutinizing, prying into, paying careful attention to, looking into a thing minutely; n.

**ئاگاداری کردن (کتپ)**

*

١ . چاو لێ بوون؛ چاو تێوە بوون؛ چاودێری کردن؛ پاراستن.

1 . Overlook, see to, look after, have charge of; preside over, attend to, take care of, vt.

٢ . ب (ئاگا لێ بوون/١)

2 . see (aga lē bün/1). vt.

**ئاگا کردن (کتپ)**

*

١ . وەئاگاهێنان؛ ئاگایێدان؛ پێ ڕاگەیاندن.

1 . Give form to; inspire, animate, make s.o. aware of; vt.

٢ . بڕاندنەوە؛ دوایی پێ هێنان؛ کۆتایی پێ هێنان.

2 . Bring to an end, put an end to, get done, end, terminate, conclude; vt.

٣ . تەواو کردن؛ جێبەجێ کردن؛ بردنەسەر (کار؛ فەرمان)؛ کردن.

3 . Perform, fulfil, execute, complete, accomplish, consummate, do; vt.

**ئاگا لێ بوون (کتپ/کتن)**

*

١ . ئاگاداریی کردن (شت)؛ کێشك لێ گرتن (ـ کێشان)؛ ئێشك گرتن؛ پارازتن؛ پاراستن؛ چاودێریی کردن؛ چاوتێوە بوون؛ چاو لێ بوون؛ چاودێریی لێ کردن.

1 . Pay attention to, keep an eye on, keep the eye on, take care of, secure against attack, attend for protection, make with caution, watch, safeguard, keep watch, keep, preserve, guard, eye, see, keep an eye upon, mark in view; vt.; i.

٢ . سەر لێ دەرچوون؛ شت لێ زانیین؛ شارەزایی لێ بوون (ـ هەبوون).

2 . Have knowledge, exercise cognition, be aware of, see through, make out, cognize, feel certain, vt., i.

٣ . لێ غافڵ نەبوون (لەشتێ).

3 . Not lose sight of (it), observe sight of (it); vt,.

**ئاگا لیّ هەبوون (کتن)**
١ . ب (ئاگادار بوون).
٢ . هەست پیّکردن؛ وەئاگاهاتن؛ ئاگاداریی لە شتیّ هەبوون.

*
1 . see (agadar bûn); vi.
2 . Sense, perceive, note, notice, feel, observe, be sensible of, feel certain of; vi.

**ئاگانامە (نل)**
بەیاننامە؛ راقە.

*
Declaration, explanation, proclamation, public announcement. c.n.

**ئاگای لە مەحمودی پیّزەواد نییە(رس)**
١ . ئاگا لیّ نەبوون (لە کاریّ یان شتیّ).
٢ . لیّ نەزانیین (لە شتیّ).

*
1 . Rhet. s. T. He knows nothing about Mahmoud, the indigent.
i.e. Know nothing about a matter, have not an acquaintance with, could not distinguish, not recognize.
2 . Be unaware of a. th. be uninformed of, ignore; vt., i.

**(خوا) ئاگای لیّتان بیّ (ف)**
١ . خوا ئاگادارتان بیّ؛ خوا بتانپاریّزیّ؛ خواتان لەگەلّ؛ ئۆغری خیّرتان بیّ.
٢ . دانیشن بە خیّر.

*
1 . Good - bye, Good -by!, farewell! (said to the person leaving); phr.
2 . Adieu!, Adieux (said to the person remaining); phr.

**ئاگایی (ن)**
پاراستن (تد).

*
Intelligence, information, acquired Knowlede; n., mod.

**ئاگر (ن)**

١ . ئاوور؛ ئاهێر؛ ئاهیر؛ ئازەر؛ ئایەر؛ ئاتر؛ ئاڤر؛ ئێر؛ یاگسی؛ دۆز.

٢ . گەرما؛ گەرمایی ئێجگار بەتین (خ).

٣ . تا (نەخۆشی) [خ].

٤ . ڕق؛ تووڕەیی (خ).

٥ . شەڕوشۆڕ (خ).

*

1 . Fire, heat and light (of combustion), n.

2 . Heat, warmth, caloric, caloricity, intense heat; metaph.

3 . Fever, febrile affection, febril disease; metaph.

4 . Spite, anger, malice, wrath, rage, malevolence, bad temper, hot temper, fighting temper; metaph.

5 . Fight, combat, battle, quarrel, personal encounter, turn at fisticuffs, metaph.

**(بە) ئاگرا (ئاگردا) گرتن (کـپ)**

١ . گەرم کردنەوە (شت)؛ شت دانە بەر تیفی ئاگر.

٢ . شیلەتێن کردن؛ شلەتێن کردن؛ شیرەتێن کردن؛ خستنە بەر تیفی ئاگر (شتی شل).

*

1 . Tepefy, tepify, make s.th. moderately warm; vt.

2 . Warm, make warm, make tepid, make slightly warm or luke warm (said of liquids); vt.

**ئاگراویی (ئان)**

١ . ب (ئاگرین ١، ٢، ٣).

٢ . ب (ئاگر گرتوو/٣).

٣ . ب (ئاگر تێ بەربوو/١، ٥).

*

**ئاگر ئەکاتەوە (ئد).**

بۆ کەسانێ بەکار دەهێنرێ بە مانای:

١ . زۆر تووڕە بوون؛ ڕق هەستان.

٢ . ئاگر دا ئەگیرسێنێ؛ ئاگر پێ ئەکات (رس).

*

used of persons and means:

1 . Get easily out of humour, be out of temper, be in the tantrums, get excited, fly into a passion, kindle; id.; vi.

2 . Rhet.s. He makes fire, he lights fire;

ئاگر باران (نل/خ)

١ . ئێجگار گەرم؛ گەرمایەکی ئێجگار بە تین.

٢ . گوللە باران؛ دەسرێژ (خ).

٣ . بۆردومان (ن).

٤ . بەلا؛ نەگبەتی؛ نیگەرانی؛ ناهەمواری؛ شەپرێوی؛ پەرێشانی؛ تەنگوچەڵمە.

٥ . نائارامی؛ هەراوهوریا؛ هەراوزەنا؛ تاژاوەیی؛ ئاژاوڵەیی؛ پشێوی؛ ئاشووب.

*

1 . An intense heat, ardor or ardour; Metaph.

2 . Discharges, firing, volley, salvo, discharge of fire - arms; Metaph.

3 . Bombardment, attack with bombs; n.

4 . Cataclysm, mistfortune, wretchedness, calamity, misery, affiction, distress, disaster, trouble and anxiety; n.

5 . Disorder, chaos, jumble, topsy - turvy, demoralization, confusion, issue, disarray; n.

ئاگر باراندن یان ئاگر باران کردن (کتپ)

گوللە باران کردن؛ تۆپ باران کردن؛ بۆردومان کردن؛ هێرش بردنە سەر (بە تەقەمەنی هەمەچەشنە).

*

Fire off massively, cannonade, bombard, assail with missiles, shell, pelt, fusillade; vt.

ئاگر بارانە (نل/خ)

١ . ئاوازێکی فۆلکلۆریی کوردییە.

٢ . بە (ڕۆژێکی گەرم) ئەڵێن؛ ڕۆژێکی گەرم و هەوا ڕاوەستاو؛ ڕۆژێکی ئێجگار گەرم.

٣ . بای گەرم (نل).

٤ . شەڕێکی گەرم (خ).

٥ . تین و تاوی شەڕ؛ گەرمەی شەڕ.

*

1 . Name of a Kurdish folk song; c.n.

2 . (Used of)a day of high temperature, a hot and windless day, a highseasoned day, an intensely hot day; n.

3 . Hot wind; c.n.

4 . A hot fight; Metaph.

5 . Intensiveness heat of fight, heat of war; n.

ئاگرباز (نل)

ئاگرخۆر؛ ئەکتەری سیرك (وا خۆی ئەنوێنێ لەبەرچاو کە ئاگر ئەخوات).

*

Fire - eater, a performer at circuses, etc. who pretends to eat fire; c.n.

ئاگر بازی (ن)

ئاگر وازی؛ یاریی ئاگر؛ شەرەئاگر؛ کاری تەقاندن و داگیرسانی فیشەکە شێتەو دەمەرقاچان بە هۆی ڕوداوێکی خۆشەوە (وەك لە ئاهەنگە و شایی گشتیدا).

*

Fire - works, firecrackers, rockets.., exploded or burned up, as in celebrations, n.

**ئاگربڕ (ن/ئان)**

ئاگرکوژێن؛ ئاگرکوژێنەوە؛ ئاگربڕکەرە؛ ئاگرکوژ؛ یەکێ لە دامودەسگای ئاگر کوژێنەوەکان.

*

Fire - man, fire - fighter, member of a fire - department; n. adj.

**ئاگربڕ کردن (کتپ)**

١ . ئاگر کوژاندنەوە؛ ئاگرکوژانەوە؛ دامرکاندنەوە (ئاگر)؛ دامرانەوە؛ تەمراندن؛ ڤەمراندن؛ خامۆش‌کردن؛ دامرکاندن؛ کوژاندنەوە و بەرگرتن لە تەشەنە کردنی ئاگر؛ ئاگر بەرهەڵست کردن لە تەنینەوە.

٢ . ئاوبە ئاگردا کردن؛ شەڕ ڕاگرتن لە نێوان دوو هێز (بە گژ یەکداچوو) (ئد).

٣ . بنبڕ کردن؛ بنەبان کردن؛ ناخۆشیی یان ئاژاوە بڕاندنەوە؛ بەرگرتن لە تەشەنەی هەراو زەنا لە نێوان دوو یان چەند کەسێکدا؛ شتی خراپ دوور خستنەوە لە خۆ یان لە کەسێ. .

٤ . هێدی کردنەوە؛ هێمن کردن؛ ئارام کردنەوە؛ بێ دەنگ کردن؛ شێنەیی کردن؛ داسەکناندن.

٥ . ئاگر خەفە کردن؛ ترووسکە لێ بڕین (ئاگر)؛ ئاگر ڕەش کردنەوە؛ خامۆش کردن.

٦ . دوابڕین؛ دوایی پێ هێنان؛ کۆتایی پێ هێنان؛ بە ئامانج گەیاندن.

*

1 . Die out fire, die down fire, die away (blazing), put out a fire, extinguish fire, cause a fire to die down, allay (the flame), quench a fire; vt.

2 . Put a stop to a battle, break up fight between two combatant sides; id.

3 . Deaden, suffocate, quench a riot, break down, smoother, bring to a close, make an end of, prevent trouble, disturbances,..... etc. from spreading; vt.

4 . Appease, pacify, silence, alleviate, mitigate, subside (anger), restore harmony to, bring round (to), give peace to, put to silence; vt.

5 . Smother fire, throttle, choke, stifle; vt.

6 . Cut off, make an end of, bring to an end, bring to a successful issue; vt.

**ئاگر بەر بوونەوە (کتن)**

ئاگر کەوتنەوە؛ ئاگر پەیدا بوون و کەوتنەوە لە شوێنێك.

*

Break forth (fire), burst out (fire), berak out great burning or general fire, blaze fiercely (fire); vt.

**ئاگر بەردانەوە (کتپ)**

ئاگرتێ بەردان؛ ئاگرنانەوە؛ ئاگر کردنەوە (لە شوێنێك)؛ ئاگرنان بە شوێنێکەوە کە بیسووتێنێ.

*

Set on fire, inflame, set fire to (purposely); vt.

ئاگر بێ دووکەڵ نابێ (پن)
دووکەڵ نی‌یە ئاگری لە بندانە بەبێ؛ دووکەڵ نی‌یە هەندی ئاگری لە ژێردا نەبێ. (بنگە)

*
There will be no smoke without fire; pvb. T. E.E. a-No smoke without fire.
b-No smoke without some fire.
c-Where there are reeds, there is water.
d-There was aye some water where the stirk drowned.

واتە: هەمووقسە و قسەلۆکێك بەڵگەیەکی ڕاستی هەرتێدایە.

i.e. Gossip, generally has an element of truth in it.

ئاگرپارە (ن/ئان/خ)

*
١ . بزێو؛ بزۆز؛ نارەحەت؛ هاروهاج، (منداڵ)؛ شەرانیی.

1 . Fire - eater, fire - brand, naughty (child), sprightly (child), quarrelsome, incendiary, agitator, brawler; n.; adj.

٢ . زیرەك؛ زرنگ؛ بەکار؛ پەیت؛ لێهاتوو.

2 . Witty, smart, ready, nimble - witted; adj.; Metaph.

٣ . ئەسکڵ؛ پۆلوو؛ پەرەنگ؛ پەنگر؛ پۆل؛ پۆلك؛ پشکۆ؛ سکڵ؛ کۆز؛ کووزمە.

3 . Live coals, cinders, spark, embers, brand, fire - brand; n.

٤ . بزووت؛ سەلکە بزووت.

4 . Piece of burning wood; smouldering remains of burning wood; n.

ئاگرپژێن (نل/ئان)

*
١ . گرکان؛ شاخی ئاگر هاوێژ؛ شاخی ئاگرین؛ کێوی ئاگرین.

1 . Volcano. c.n.

٢ . ئاگرین (ئان).

2 . Volcanic, one liable to break out violently; adj.

ئاگر پەرست (ئان/ن)

*
ئاگر پارێز؛ خۆر پەرست؛ ڕۆژ پەرست؛ مەجووسی؛ مەجۆسی.

Fire - worshippers, Magians, Parsees; adj.; n.

ئاگر پێش کردن (کتپ)
ب (ئاگر خۆش کردن).

ئاگر پێ کردن (کتپ)
ئاگر هەڵکردن؛ ئاگر داگیرساندن؛ ئاگر هەڵگیر ساندن.

*
Fire, light a fire, ignite, kindle, cause to light up; vt.

ئاگر پێوەنان (کتپ)
ب (ئاگر تێ بەردان).

ئاگرت لێ بارێ! (رس. بۆدەربڕینی تووڕەیی؛ نارەحەتیی.. تاد).

*
Rhet.s. (an expression of anger, annoyance, etc).

بەردت لێ بارێ!؛ بەلات لێ بارێ!؛ بەلام لێ دایت!.

May fire descendupon you!, God may curse you!, May fire pour down on you!, Blast you!, Dam !! `, Oh! damned it, Darn!, Dog - gone!, Bother it, oh!curse it; excl.; interj.

ئاگر تێ بەربوو (ئان/خ)
١ . ئاگر تێ کەوتوو؛ ئاگر تێ چوو؛ ئاگر گرتوو؛ گڕ گرتوو.

*
1 . Burning, flame, fiery, burnt, blazed scorching, flaming, blazing, taken fire, caught fire, on fire; adj.

٢ . پەرێشان (بۆ یار یان دڵخواز)[خ].

2 . Bereft of a dear one, feeling a passionate love for, having pleased attention for, keenly interested; Metaph.

٣ . چوختیی؛ لاسار؛ چەقاوەسوو؛ نەسرموت(خ).

3 . Saucy, impudent, brazenfaced, harum - scurum, uneasy, unresting, rash, insolent; adj.; Metaph.

٤ . برزوو؛ شەڕ فرۆش؛ تەشقەڵەچیی (خ).

4 . Pugnacious, combative, contentious; Metaph.

٥ . ئالۆشاویی؛ بە ئالۆش؛ ئالۆشدار؛ حەشەریی (ئافرەت)؛ بەجۆش؛ گەرم (ژن).

5 . Carnal, libidinous, lecherous, lickerish, betaera, a voluptuous woman; adj.

ئاگر تێ بەربوون (کتن/ئد)
١ . ئاگر تێ کەوتن؛ ئاگر تێ چوون؛ ئاگر گرتن؛ گڕ گرتن؛ سووتان (شتێ)؛ ئاگر بەربوون لە شتێ.

*
1 . Smolder, flame, catch fire, begin to burn, be on fire; vi.

٢ . فەوتان؛ لەناوچوون؛ تەفروتوونابوون (تد).

2 . Be burnt down, come to onthing, end in smoke; vi.; id.

٣ . بەزەیی پێداهاتنەوە؛ دڵسووتان بۆ کەسێ؛ ئاگرچوونە گیان (بۆکەسێ)؛ بەزەیی هاتنەوە بە یەکێکدا؛ ئاگر بۆ کەسێ تێ بەربوون بەزەیی پێدا هاتن.

3 . Feel sympathy for, become tender - hearted, feel ill at ease, be affectionate to a.o., have pity for, sympathize with, have compassion for, sympathize with in distress, feel sorry for, show sorrow for, feel pity for, be warm - hearted for; vi.; id.

٤ . تووڕە بوون؛ ڕق هەڵسان؛ ڕقهەستان؛ فیشەکی بوون.

4 . Become agitated, be out of temper, get angry; id.

٥ . لە سەر قسە ڕۆیشتن؛ درێژەدان بە گفتوگۆ؛ درێژ دادڕی کردن.

5 . Engage in discussion, keep disussion going, talk volubly; id.

٦ . ئارەزوو هەڵسان (ـ هەستان)؛ زەوق هەستان (ـ جووڵان)؛ مەیل جووڵان؛ بزواتن؛ بزووتن؛ خونك بوون.

6 . Become stimulated, lust after, have carnal desire for, work up, whet, lust, stimulate; vi.; id.

٧ . سرەوت لە بەر بڕان؛ نەسرەوتن؛ هاتوچۆ کردن (بەزۆری)؛ ماخۆلان گرتن.

7 . Feel restless, have the feeling of being unreposed, move about, work with great energy, be in a frequent state of movement, be moving about, be on the move; vi; id.

**ئاگر تێ بەردان (کتپ)**

*

١ . ئاگر پێوە نان؛ ئاوور تێ بەردان؛ گڕ تێ بەردان؛ سووتاندن؛ سۆزاندن.

1 . Set on fire, set fire to, kindle, ignite, inflame, light; vt.

*

٢ . ڕق هەڵساندن؛ تووڕە کردن؛ پەست کردن؛ زویر کردن؛ دڵ ئێشاندن؛ تێوە ژەندن؛ فیشەکی کردن.

2 . Make angry, irritate, grieve, anger, afflict, provoke, aggrieve; vt.

٣ . گاڵدان؛ هاندان؛ هانەهانەدان؛ ئەڕاختن؛ فیت دان.

3 . Incite, instigate, impel, poke, urge a.o. to; encourage s.o. to do s.th.; vt.

٤ . زیان پێ گەیاندن؛ زیان پێ دان.

4 . Do harm to, hurt, harm, damage, injure.

٥ . حەز جووڵاندن؛ بزواندن (مەیل)؛ بونك کردن.

5 . Inspire a desire, desire ardently, long for; vt.

**ئاگر تێ چوون (کتن)**

*

١ . ب (ئاگر تێ بەربوون/١، ٣، ٤، ٦، ٧).

٢ . ب (ئاگر تێ بەر بوون/٢).

٣ . تەماشا کردن بە حەسادەتەوە؛ چاو پێ‌هەڵهێنان (بە کەسێکدا).

3 . Cast envious look upon, cast evil eye upon, aim evil eye at, look curiously at s.o. or s.th. which surprises one; vt; id.

**ئاگر چوونە گیان (کتن)**

ب (ئاگر تێ بەربوون/٣).

●

**ئاگرخانە (نل)**

●

١ . جەهەندەم؛ جەهەننەم؛ دۆزە؛ دۆزەخ.

1 . Hell, Hell-fire, Gehenna, Erobus, sheol, Tophet, Hades, Tartarus, Avernus.

٢ . ئاگرگە؛ ئاگرگا؛ پەرستگای زەردەشتیەکان.

2 . Fire - temple, place of Zoroastrian worship; n.

٣ . ب (ئاتەشخانە/٢).

**ئاگرخۆش (ئان/خ)**

●

١ . قسە خۆش؛ زمان شیرین.

1 . Pleasantly spoken, apt at repartee, witty; adj; Metaph.

٢ . خۆش گوفتار؛ دەم بە پێکەنین؛ گاڵتەچیی؛ سوعبەتچیی.

2 . Facitious, jocular, jocose, waggish, droll; adj.

**ئاگر خۆش کردن (کتپ/ئد)**

●

١ . ئاگر پێش کردن و تێك وەردان؛ ئاگر گەشاندنەوە؛ ئاگر گەش کردنەوە.

1 . Stir up a fire by jabbing the coals up, make fire burn fiercely, stir up and fan a fire, tend a furnace, fan the fire, poke; vt.

٢ . فیتنەیی کردن؛ قسە بە خواریی گێرانەوە؛ پێچوپەنا خستنە گفتو گۆوە؛ قسە هێنان و بردن لە نێوان دوو کەسدا؛ نێوان دووکەس ناخۆش کردن.

2 . Full speech with lies, relate talks malevolently, sow discord between; vt.; id.

٣ . ئاژاوە نانەوە؛ ئاژاوە گێران؛ ئاشوویە گەرمترکردن؛ گوێەند گێران (ئد).

3 . Make turbulance, cause on increase of disturbance, fan the fire of a quarrel, fan the fire of one's anger; id.

(پێنگ)

E.E.

a. Add fuel to the fire.

b. Pour oil on the flames.

c. Pour oil on the fire (is not the way to quench it).

**ئاگر خۆشکەرە** (ئان/نك/خ)

١ . مەسەبی؛ کەوگیری ئاگر؛ ئامرازی پێشکردن و تێکوەردانی ئاگر (وەك کۆلەوۆژ، مقاش. . .) بۆ مقەلی، ئاگردان، یا تەنوور.

٢ . مایە فیتنە؛ فیتنەباز؛ دووزمان؛ تێچەند؛ تێچێن؛ پێکوڵ چەند؛ ئاگری بن کا (خ).

*

1 . Fire irons, the poker, the tongs and shovel used for tending a fire - place, hearth, oven, etc; n. pl.

2 . Temper, seducer, misleading, disturber, alluring, captivating, agitator, incindiary, demagogue, exciter of active discussion, stirrer up of perturbation, a concealed draw back in the affair, a hidden snake in the grass (anguis in herba); Metaph.; n. adj.

**ئاگرخۆش** (نل/ئان)

خۆشەویست؛ دڵئارام؛ دلآرام؛ یار؛ یاوەر.

*

Darling, dear, beloved, much - loved, sweet heart; c.n.; adj.

**ئاگر داگیرساندن** (کتپ/ئد)

١ . ئاگر هەڵگیرساندن؛ ئاگر داگیراندن؛ ئاگر پێ کردن؛ ئاگر هەڵکردن.

*

1 . Blaze up fire, make a fire, light fire, kindle fire, set on fire, make the fire to blaze, give light to, cause to give off light, apply the match to; vt.

٢ . شەڕ هەڵگیرساندن؛ ئاژاوەنانەوە؛ ئاشووبنانەوە.

2 . Stir war, kindle war, make war, make unsettlement, unsettle; vt.; id.

**ئاگردان** (١) (نل)

ئاگردانك؛ ئاگرگا؛ ئاوورگە؛ ئاوورجا؛ ئەرگە؛ ئۆجاخ؛ ئوجاخ؛ کۆرك؛ گورگە؛ قوولکەی ئاگر؛ جێ ئاگر؛ ئاوورخانە؛ ئاگرخانە؛ ئاوارخانە.

*

Fire - place, fire - bed, grate, hearth, receptacle for fuel; c.n.

[**ئاگر دان** (٢)](کتپ)

١ . تەقاندن (چەك)؛ تفەنگ. . . تاد، خاڵی کردنەوە، بە تەقاندنی گوللەکانی ناوی.

*

1 . Fire off, release the charge of a gun, etc., discharge (gun); vt.

٢ . دەر کردن؛ قاو دان؛ دەرپەڕاندن (کەسێ لە شوێنێ. . .).

2 . Constrain a.o. to leave a place or circle, compel one to go away from a circle, oblige one to leave a place; vt.

٣ . هاویشتن؛ تێ گرتن؛ فرێدان.
3 . Eject, expel, hurl, discharge; vt.

٤ . تەقاندنەوە.
4 . Burst, break open; vt.

٥ . تێز کردن؛ تیژکردن؛ هاندان؛ پاڵ پێوەنان.
5 . Spur on, urge on, stir up, urge forward, incite, impel; vt.

**ئاگردوو** (نل)
سووتەمەنیی.
●
Fuel, firing material, combustibles, material for burning; c.n.

**ئاگر کپ کردن** (کتپ)
ئاگر خەفەکردن؛ گڕی ئاگر یان گەرمایی ئاگر کەم کردن.
●
Cause fire to smolder, cover a fire, exclude air from fire, cause a fire to die down, check or reduce fire, damp down a fire, moderate fire or heat of a fire; vt.

**ئاگر کردن** (کتپ)
ئاگر پێ کردن؛ ئاگر خۆش کردن.
●
Light fire, set on fire, kindle; vt.

**ئاگر کردنەوە** (کتپ/کتن/ئد)
١ . تووڕە بوون؛ ڕق هەستان؛ هەڵچوون.
●
1 . Fly into a passion, get excited, be angry, be excited; vi.; id.

٢ . ئاگر نانەوە؛ ئاگر خستنەوە؛ ئاگر بەردانەوە وەك تاوانێك.
2 . Light a fire, make fire blaze up, commit an incendiary crime, make a distructive fire, commit arson; vt.

٣ . شەڕو شۆڕ بەرپا کردن؛ هەراوزەنا دامەزراندن.
3 . Kindle war, create riot; vt.; id.

**ئاگرکوژ** (نل)
ب (ئاگر بڕ).
●
see (agir bir); c.n.

**ئاگر کوژاندنەوە** (کتپ/ئد)
ئاگر کوژاننەوە؛ ب (ئاگر بڕ کردن).
●
see (agir bir̃ kirdin); vt.

**ئاگر کوژێن** (نل/ئان)
ب (ئاگربڕ).
●
see (agir bir) ; c.n.; adj.

**ئاگر کەوتنە گیان (کتن/ئد)**
١ . ئاگر تێ بەربوون؛ ئاگر گرتن.
٢ . ئارام لێ هەڵگیران؛ کەوتنە تالوکە و جێگە بە خۆ نەگرتن.

⁕
1 . Catch fire, begin to burn, take fire; vi.; id.
2 . Be uneasy, get into an unpleasant situation and feel ill at ease, get into trouble, get into a difficult situation, get into a mess; vi.; id.

**ئاگر کەوتنەماڵ (کتن/ئد)**
١ . ماڵ سووتان.
٢ . ماڵ وێران بوون؛ ماڵ کاول بوون (- تێکچوون؛ - خاپوور بوون؛ - کەمباخ بوون).

⁕
1 . Have one's house or property burnt down; vi.
2 . Have one's house or property ruined or disturbed, have one's house being disturbed, have one's condition put out of order, put in commotion; vi.; id.

**ئاگر کەوتنەوە (کتن)**
ئاگر بەربوونەوە.

⁕
Break out a fire (or conflagration); vi.

**ئاگر گرتن (کتن/ئد)**
١ . ئاگر تێ بەربوون؛ داگیرسان (ئاگر)؛ گر گرتن؛ بڵێسە سەندن؛ کڵپەکردن.
٢ . تووڕە بوون (لە پرێکدا)؛ هەڵچوون؛ دڵگیر بوون (لە کەسێ لە سەر شتێ)؛ توند بوون (لە بارەی شتێکەوە).

⁕
1 . Take fire, flare out, burst into flame, seize fire, blaze up (fire); v.i.
2 . Become suddenly angry, become excited, become provoked, fly into a passion, be angry with a.o. for the sake of, become upset about a matter; vi., id.

**ئاگر گرتوو (ئان/خ)**
١ . بزێو؛ لاسار (مناڵ)؛ بێ گوێ (مناڵ).
٢ . ڕق هەستاو؛ تووڕە بوو؛ قین‌گرتوو؛ شێتگیربوو.
٣ . ب (ئاگر تێ بەربوو/١).
٤ . گەرم داهاتوو
٥ . گەرمایی‌یەکی پرۆکێنەر (ن/خ).

⁕
1 . A naughty boy, preverse, a disobedient child, mischievous.
2 . In a passion, in a pet, in the tantrums, greatly excited, obstinate, rough in behaviour; adj., metaph.
3 . see (agir te berbû), adj.
4 . Full of ardour, having burning heat; adj.
5 . Burning heat, ardour (of fire), great heat (of fire....); n., metaph.

ئاگر گەشاندنەوە (کتپ)
ئاگر گەشانەنەوە؛ ئاگر گەش کردنەوە؛ ئاگر باوەشێن کردن.

Blaze fire, stir up a fire, poke a fire, stoke and fan a fire; vt.

ئاگر گەش کردنەوە (کتپ)
ب (ئاگر گەشاندنەوە).

see (agir gešandnewe); vt.

ئاگر گەشکەرە (نل)
تاولەمە؛ بوخوردان؛ ئاگرتێیندەرە.

Censer; c.n.

ئاگرگیرە (نل/ئان)
١ . دەستئاگر؛ دەسئاگر؛ دەساگر؛ دار یان هەرچ سووتەمەنییەك گورج ئاگر بگرێ.
٢ . چاوگە؛ دەستەچێیلە؛ چیلکەو چەواڵ بۆ ئاگر کردنەوە دەس بدات؛ چاوگ؛ ئاگرەگیرە.

1 . An inflammable substance, combustible thing, wood, substance, etc., that can be easily burned up, yielding fire at once, c.n.; adj.
2 . Kindling, bits of wood or things for starting a fire,, small fire - wood; n.

ئاگر لە چاو بارین (ئد)
ئاگر لە چاو بوونەوە؛ شێتگیر بوون.

Be greatly excited, become aroused, fly into a passion; id.

ئاگر لێ بارین (کتن/ئد)
بەلا بەسەر هاتن؛ تووشی چورتم بوون.

Be entangled, be involved in a difficulty; vi.; id.

ئاگرناك (نل/ئان)
تووڕەوتڕۆ؛ ترزۆ؛ کەللەیی؛ فیشەکیی؛ دەمڕیی.

Choleric, hot - tempered, fiery, irascible, waspish, petulant; c.n.; adj.

ئاگر نانەوە (کتپ)
ب (ئاگر کردنەوە).

see (agir kirdnewe); vt.

**ئاگرنێنەوە** (ن/خ)
١ . ئاگرخۆشکەر؛ ئاگرپێشکەر.
٢ . ئاگرخۆشکەرە؛ مایەفیتنە؛ ئاژاوەچی.

*
1 . Fire - raiser, a person who tends fire; n.
2 . Stirrer up of commotion, exciter of active discussion, firebrand; metaph.

**ئاگر وا لە دەمیدا، یان ئاگر هاڵە دەمیا،**
١ . ب (ئاگری لە دەمدایە)[ئد].
٢ .{دەم بە هەراش، زۆر بێژ ، چەنە باز؛} بوون.

*
1 . see (agiri le demdaye); id.
2 . To be. garrulous (loquacious, raver, talkative, prating, babbling; babbler).

**ئاگر و بایان نەووتوە** (ئ)
١ . دوو شت یان دوو کەسی نەگونجاو.
٢ . قسە و باسی نەگونجاو؛ نوسراوێکی نارێك.

*
1 . Two inconsistent things or persons, id.
2 . An inconsistent argument, an inconsistent writing, (either of two things that are as different as possible from each other); id.

**ئاگرو دوو** (نل/خ)
ماڵ و حاڵ؛ خاووخێزان، گوێ ئاگردان؛ خانە و کولانە.

*
Hearth - side, hearth, the fireside as the center of family life, the home, family circle; c.n.; metaph.

**ئاگر و دوو بران** (کتن/ئد)
١ . ماڵ وێران بوون؛ ماڵ کاول بوون؛ ئاسەوار نەمان؛ ئاسەوار بران.
٢ . نەمان؛ تەفروتون بوون؛ کۆتایی هاتن؛ دوماهی هاتن.
٣ . پژان؛ پشان؛ چرژان؛ بلاوو جیاواز بوونەوە.

*
1 . Go to ruin, come to ruin, have one's house gone to ruin; vi.; id.
2 . Die away, go out of existence, fade out, be heard of no more, come to an end, conclude; vi., id.
3 . Drive out, turn out, scatter, break away; go different ways, be dissipated, disperse; vi.; id.

**ئاگرۆك** (ئان/خ)
١ . ئاشوبگێر؛ کەسێ ئاژاوە بنێتەوە.
٢ . دووزمان؛ دووزبان؛ بوختانکەر؛

*
1 . Anarchist, one who creates disturbances.
2 . Double - tongued, deceitful, double -

دووڕوو.
faced, knavish; adj.

٣ . بای سەبوون (سەمووم)؛ شەرایەکە ئەدا لە مەرمزە.
3 . Simoom, pestilential hot wind, simoom blasting paddy field; n.

**ئاگره (ن/نغ)**
•
١ . ئاتەشەك؛ سیفلیس.
1 . Syphilis, mild chancre; n; dise.
٢ . (یاریی هەنگڵە شەلێ)، دۆڕاو داثەبێ و براوان سنگەوبازی بەسەردا ئەدەن بەقاچ کراوەییەوە.
2 . A game in which players charge each other by one unemployed feet and the loser must have his back bent for the other players to take turns jumping, with legs spread wide over him; n.
٣ . ئاگرەکە؛ ئاورە؛ نەخۆشییەکی تایبەتیی پێستە.
3 . Erysipeles, disease of the skin (Acne, etc.); n.; dise.
٤ . شەرا؛ گرە؛ ئاگرۆك (ن)
4 . Simoom, a hot dry (sand - laden) wind; n.
٥ . ئارنگە؛ بەورەشینکە؛ لەرزك؛ هەولە.
5 . Anthrax, pustula - maligna, malignant boil, splenic fever, carbon - fever; n.; dise.

**ئاگرەخۆشە (نل)**
•
ئاورگە؛ سووکە؛ پەلۆختە؛ ئەو ئاگرەی لە دەرەوەی ماڵ ئەکرێتەوە.
Bon-fire, a fire kindled out of doors; c.n.

**ئاگری بن کا (خ)**
•
١ . ئاگری ژێرکا؛ ئاوی ژێرکا؛ ئاوژێرکا؛ ئاشۆبگێڕ؛ گیروگرفت هاوەر. (بنگە)
1 . Lit. Fire (hidden) in the straw, or under straw, metaph.
E.E. A snake hidden in the grass. i.e. (There is) a concealed draw back in the affair (mischievous, troublesome).
٢ . زیرەك؛ بەلاّ (خ).
2 . Shrewd, sly, crafty, deep (person).
٣ . زیانکار؛ دۆخان؛ گایبنە؛ سەر کزی دڵ وریا؛ مایە فیتنە؛ دوپشکی کایەن.
3 . One who does harm often behind curtain, one who mischieves underhand or out of sight, a sly and treacherous person, source of mischief, wrong - doer, snake in the grass, metaph.

ئاگری بێ ئامان (ئد)
بەڵایەکی گرنگی بێ چارە؛ چەرمەسەری یەکی گەورە؛ چەرمەسەریکی گەورە.

*

An extreme calamity, a very great misfortune, an extreme distress or anxiety; id.

ئاگری پیوەنیت بوکوروز (بوسو؛ بونسو؛ بوچرووك) ی لێ هەڵناسیت (خ)
بەیەکیکی رووت وقووت وهەژار دەووترێ.
١ . هەژار؛ کەرموالە؛ پیداویست؛ بێنەوا؛ نەبوو؛ بێسامان؛ بێ دەر؛ بێ دەرەتان.
٢ . داماو؛ بێ دەست؛ دەستەووستان؛ بەلەنگاز؛ بێوەر (ئان).

*

Used of a very miserable person. i.e.
1 . One needing clothing, shelter and food, one in poverty, impoverished, needy, in want, indigent, poor, a very poor person, out of the elbows, in distress, pinched, straitened; metaph.
2 . Inferior, inactive, idle, indolent, sluggish, inert, unproductive; adj.

ئاگری زمان تییژترە (ئد)
ئاگر زووان تیژترە؛ ووتەی ناخوش جەرگەبرە؛ برینی قسەی ناخوش چاك نابێتەوە.
(بنگە)

*

The slip of the tongue will never be recovered. id.; E.E.
a. A blow with a word strikes deeper than a blow with sword.
b. words cut more than swords.
c. The tongue is not steel yet it cuts.
d. There is no venom to that of the tongue.
e. The tongue is more venomous than a serpent's sting.
f. A good tongue is a good weapon.

ئاگری قوورمت (نل/ئان/خ)
ئاگری سروشتی.
١ . بەڵای لابەلا؛ قەزاوقەدەر (ن).
٢ . بزێو؛ بزۆز؛ نەسرموت (ئان/خ).
٣ . ئاشوویگێر؛ شەڕانیی؛ شەڕفرۆش (ئان).

*

Lit. Fire brought about by providence. i.e.
1 . Inevitable calamity, fate, destiny, what happens or has happened to a person; n.
2 . Impudent, insolent, impertinent boy, shamelessly bold; metaph.; adj.
3 . Tumultuous, tumultuary, blustering fellow, quarelsome person; adj.

٤ . بەدخوو؛ بەدمەست.

4 . Roisterer, swaggerer, bully; adj.

٥ . لێهاتوو؛ کۆك؛ بەهێز؛ بەتین؛ بەتوانا؛ هێزدار؛ تیندار.

5 . Efficacious, potent, cognet, effective, forcible, strong, energetic; adj.

٦ . کار لەدەست هاتوو؛ کارامە؛ کارئاشنا؛ کارزان (ئان).

6 . Competent, sagacious, efficient, qualified; adj.

**ئاگری لە دەمدایە**

بۆکەسانێ بەکارئەهێنرێ بەمانای:

Used of persons and means: (ter, id).

١ . شەڕانیی؛ تووڕە و تڕۆ (بوون)

1 . to be fire - eater (quarrelsome, brawler, a hot tempered person).

٢ . دەم هەراش؛ دەمەوەڕ؛ درێژدادر؛ چەنەباز؛ چیرە درێژ؛ چەوچەوکەر؛ زۆربڵێ؛ قەرەچەناغ؛ ووتەووتکەر، لەوچە؛ هەڵەوەڕ (بوون، کردن)

2 . To be Blabber (babbler, blab, prater, prattling, tattler, telltale, loquacious, talkative, garrulous).

٣ . [بێشەرم؛ بێئابروو (ژن یاپیاو)] (بوون)

3 . to be Shameless (unladylike, ungentlemanly, indecorous, devoid of honour).

٤ . (تەفرەدەر؛ تەپکەر؛ چەپەڵ؛ چەپ ئەنداز؛ ناپاك؛ گەندە) (بوون).

4 . to be Perfidious (treacherous, deceitful, disloyal, dishonorable, disingenuous, false - hearted).

**ئاگری لەماڵی بەردا [ئاگرلەماڵبەردان]** (رس/ئد)

١ . ئاگر بەردان لە ماڵی کەسێ.

1 . Rhet. s. Set fire to s. one's property or house.

٢ . ماڵ وێران کردن؛ کاول کردن؛ تەفر و تونا کردن؛ ڕووخاندن؛ تەخت کردن؛ ڕماندن (ئد).

2 . Bring s. one's property to ruin, overthrow, throw down, overturn, destroy, demolish; id.; vt.

٣ . ئاژاوە تێ خستن؛ ئاژاوە گێران؛ هەراو هوریا کردن (کتپ/ئد).

3 . Disturb the peace of, throw into confusion, break in upon with noise; organize disturbance, create agitation.

**ئاگریی (ئان/خ)**

تووڕە؛ تونـد؛ تونـدوتیـژ (ڕەوشت)؛ کەللەیی.

Hot - tempered, head - strong, hot headed, heady, hot - brained, man of touchy temper; adj., metaph.

**ئاگرین (ئان)**

١  گەرم (وەك/ئاگر)؛ ئاگراویی گڕاویی؛ ئاگرپژێن (ئان).
٢ . داگیرساو.
٣ . ئاورین؛ بەتاسە؛ بزوێنەر؛ پڕ جۆش و خرۆش (ئان).
٤ . سوور (وەك ڕەنگی ئاگر یان گڕی ئاگر)؛ سوور بوەوە (شت).
٥ . ئاگراویی (مرۆو)؛ بەجۆش (ئافرەت)؛ خورواویی (ئافرەت) [ئان/خ].

●
1 . Fiery, igneous, fervid, fervent, lurid, of fire, hot, volcanic; adj.
2 . Ardent, impetuous; adj.
3 . Vehement, passionate, rampant, high - wrought and violent; adj.
4 . Fire - red, glowing; adj.
5 . An erotic person, sexy, voluptuary, anacreontic, voluptuous (woman); adj.; metaph.

**ئاگە (ئاك)**

١ . ئەوێ؛ ئەوێندەرێ.
٢ . ئنجا؛ دوایی؛ لەوێ بەدواوە.

●
1 . There, in that place; adv.
2 . Subsequently, afterward, thereafter, after that; adv.

**ئال (ن)**

بالآ بەرزە (پەنجەی دەست)؛ پەنجەی ناوەڕاست (دەست).

●
Middle - finger, third finger; n.

**ئالخواج (ن)**

دۆشاومژە؛ پەنجەی ئیشارەت پێ کردن؛ پەنجەی تەنیشت پەنجەگەورە (دەس).

●
Fore - finger, next to the thumb, index finger, first finger, the finger nearest the thumb; n.

**ئالوودار (ن/ئان)**

١ . ئالۆو کەوتوو؛ قورگ هاتووەوەیەك.
٢ . کۆسپ؛ کوسپە؛ ڕێگر (شت)؛ هەرج کۆسپێك خرابێتە بەر ڕێگە.

●
1 . Affected by tonsillitis; adj.
2 . Crossbeam, check - point - mast, any mast stopping up a passage; n.

**ئالوودە (ئان)**

١ . گیرۆدە؛ گرفتار؛ بواژۆ؛ بـووئاژۆ؛ بژۆ؛ بڵکیاو؛ بڵکیاگ؛ تلاو؛ تلیاگ.

٢ . هۆگر؛ ڕاهاتوو (ئان).

●
1 . Contaminated, embarrassed, implicated, entangled with, involved with, caused to be mixed up, earned to accept., adj.
2 . Familiarized to, accustomed to, used to, wonted, adj.

٣ . دووچار (چورتم یا کاروبارێکی گران)؛ ئاڵفته (کاروبارێکی نارەحەت).
٤ . لەکەدار؛ عەیبدار.
٥ . تووڕە و ترزۆ؛ توندە میزاج.

3 . Involved in (a difficult case), embarked in (a difficult affair); adj.
4 . Stained, polluted; adj.
5 . Hot - tempered, hot - blooded.

**ئالووسیی (ن)**

قۆزیی؛ جوانیی جل و بەرگ و ڕواڵەت؛ ڕێك و پێکیی جل و بەرگ و نیگار.

*
Comeliness, seemliness, beauty of uniform and the face; n.

**ئالەت (ن)**

١ . ئامراز؛ ئەمراز؛ مراز.
٢ . هۆ؛ بۆنە.
٣ . ئەلە (مەبەس ئامرازی پیاوەتیی و نێرینەیی ئادەمیزادە).

*
1 . Instrument, tool, implement, apparatus.
2 . Means, device, contrivance, appliance.
3 . Male genital organ, the male sexual organ, the penis, glans penis, testicles, etc; n.

**ئالیکار (ن)**

هاریکار؛ ئاریکار؛ یاریکار؛ یاریدەدەر؛ یارمەتیدەر؛ یاریەدەر؛ پاڵپشت.

*
Assistant, helper, collaborator, co-aid, co-adjutor, co-operator, aider, abettor.; n.

**ئالی (ن/پ)**

١ . لا؛ لێوار؛ کەنار؛ تەك؛ جەم؛ قەراغ؛ قەد؛ ڕۆخ؛ ڕەخ؛ لبا؛ لاڵ؛ هیل.
٢ . لایەك؛ نیوە؛ نیف؛ بەشێ.
٣ . ڕووکار؛ ڕاست؛ ئاست؛ حاست؛ کن؛ نك؛ گڤك؛ لایەن؛ ئاقار؛ ڕوو.
٤ . لە؛ بە؛ ناو؛ سەر؛ دەر (پ).
٥ . کەناری دەریا؛ گوێ دەریا.

*
1 . Side, edge, brink, brim, border, verge, margin, hem, rim, flank, fringe.; n.
2 . Part, (a) part, the half; piece, one portion, section; n.
3 . Direction, course, way, track, road, place, nearness, proximity, presence, line of motion, the front part of anything; n.
4 . At, by, through, over, along., prep.
5 . Sea - shore, sea - coast, sea - board; beach, strand, shore, coast; n.

**(ژ ئێ) ئالیی (ف)**

لەولاوە.

*
At the far side, at that side; phr.

**ئالیستن (نج/کتپ)**

١ . ئالاستن؛ دالستن؛ دالیستن؛ دالێسان؛ زمان پێداهێنان؛ لێسین؛ لستن؛ لستنەوە؛ لێسانەوە.

٢ . هەڵ لووشیین؛ لستنەوە وخواردن بەزمان؛ ماشیینەوە (خواردن یا خواردنەوە بە هەڵپەوە).

❁

1 . Lick, lick up, pass the tongue over; infin., n.; vt.

2 . Lap, lap up, take up with the tongue, take in eagerly, eat or drink greedily; vt.

**ئالیك (ن)**

١ . ئالك، ئالف، ئیم، ئیم، دیزیی؛ زرکۆ؛ قەرسیل؛ کاوجۆ یان گیا و گەلا و گوڵ کە ئە درێ بە چواریێ.

٢ . ئالفزار؛ ئالفجار (شوێنێ کە لەوەری زۆرێ)؛ لەوەر؛ لەوەرگا؛ لەوەرجار؛ جێ لەوەر.

❁

1 . Forage, provender, food (for cattle), foder grass, grass, herb, coarse food for cattle, horses, sheep, etc., as hay, barely, straw, grass and corn stalks; n.

2 . Grazing, grazing ground, grazing land, pasture ground, grass land, range, pasture; n.

**ئالیكدان (کتپ)**

ئالفپێدان؛ ئالیك خستنە بەر وولاخ... تاد؛ چەراندن؛ لەوەڕاندن.

❁

Graze, tend flocks, browse cattle, feed with grass, pasture; vt.

**ئاڵ (١) (ئان)**

١ . سوور؛ سۆر؛ کورەن؛ کورەند؛ ڕەنگی سووری گەش.

٢ . ڕەنگ سوور؛ ڕوومەت سوور؛ ڕووگەش.

❁

1 . Red, scarlet, carmine; crimson, magenta; adj.

2 . Reddish, ruddy, rosy, flushed, blushing, having a healthy red colour.; adj.

**ئاڵ (٢) (ن/نخ)**

١ . ئاڵە؛ دایکی ئاڵ؛ دایکی هاڵ؛ شەوە (ڕۆحێکی ئەفسانەیە، باوەڕ وایە ژنی زەیستان یان منالەکەی ئەکوژێ).

٢ . هاڵ؛ تای زەیستان؛ زەیستانە تا (نخ).

٣ . خێرا؛ گورج؛ چابوك؛ چاپوك؛ بەدەست و برد (ئان).

❁

1 . Puerperal septicemia, evil spirit believed to kill woman recently delivered of child or an infant child; n.

2 . Puerperal - fever, child - bed - fever birth; dis.

3 . Quick, active, nimble, agile, brisk; adj.

**ئالا (ن)**

١ . بەیداغ؛ بەیداخ؛ بەندێر؛ بەیرەق؛ درەوش.
٢ . پێنوس؛ خامە؛ قەڵەم ئووچ؛ قەڵەم (نووسین).

●
1 . Flag, standard, ensign, gonfalon, pennon, pennant, banner; n.
2 . Pen, quill, stylus, style of writing; n.

**ئالادار (ن/س)**

عەلەمدار؛ بەیرەقدار؛ هەڵگری بەیداخ (سوپا)؛ بەندێرە (سوارە).

●
Standard - bearer, color - bearer, colour - sergeant, Ensign (of infantry), coronet (of cavalary); n.

**ئالاڤ (ن)**

١ . هالاو؛ هەڵاو؛ گەرمایی، تین، هەڵم و هەوای گەرم.
٢ . بڵێسە؛ کڵپە؛ مەشخەڵ؛ شاپلیتە.

●
1 . Steam, warmth, moderate heat, glow, hot - air; n.
2 . Strainer, fire - brand, lighted - wick, torch, flambeau, link, blazing brand.; n.

**ئالان (کتن)**

١ . پێچ خواردن (دووشت‌یا زیاتر بەیەکەوە).
٢ . گینگڵ خواردن؛ پەپکە بەستن؛ پەپکە دان؛ پەپکە خواردن.

●
1 . Be crooked spirally; be twisted, be convolved; vi.
2 . Coil, become coiled up, make coils, form spiral ring; vi.

**ئالاندن (کتپ)**

ئالانن؛ تێك ئالاندن؛ ڕ ئالاندن؛ بادان (دووشت بەیەکەوە).

●
Twine, twist together; wind about, wind around; vt.

**ئالاو (ن/ئان)**

١ . ب (ئالاڤ/١).
٢ . ئالۆزکاو؛ تێك ئالاو (بە نارێکی) [ئان].

●
1 . see (alav/1); n.
2 . Tangled, interweaved (confusedly), intertwined snarly; adj.

**ئالاو والا (ئان)**

ب (ئاڵ و والا ٢، ٣، ٤، ٥).

●
see (alu wala 2, 3, 4, 5); adj.

**ئالاو والا پۆش (خ)**
تەرپۆش؛ زەرقیپۆش؛ زەردو سوورپۆش؛ تەن‌تەنەو بەن‌بەنە پۆش.

*
In tawdry outfit, in showy and gaudry clothings, in full fig, dressed in a showy manner; metaph.

**ئالایش (ن)**
کۆبوونەوە لە شەودا.

*
Night - meeting, night - conversation; n.

**ئالایشت (ن)**
ناتەواویی؛ کەم و کورتیی (لە نەریتدا).

*
Defect, vice, detraction, want (of piety or judgement); n.

**ئاڵ بردنەوە (کتن)**
مردن (ژنی زەیستان، لە ئەنجامی منداڵ بوونا)؛ بە نەخۆشیی ئاڵ دووچار ـ بوون (ژنی زەیستان).

*
Get septic poisoning during childbirth (woman); vi.

**ئاڵ بوونەوە (کتن)**
دانی ئادەمیزاد سڕبوون.

*
Be set on edge (teeth), set on edge (of the teeth); vi.

**ئاڵتوون (ن)**
١ . زێڕ؛ تەلا؛ زێڕی زەرد؛ زێڕی پاك؛ زێڕی بێگەرد.
٢ . خشڵ؛ زێڕ و زیو.
٣ . جیازیی (بووك)

*
1 . Gold, Aurum, gilt, gilding, pure gold; n.

2 . Jewellery, jewelry, jewels, bijouteri, trinkets; n.

3 . Ornament (bride attribute); n.

**ئاڵتوون لە قوڕدا دیارە (رس)**
بۆ باس کردنی جوانیی ئافرەت و رێك و پێکیی ڕەفتاری بەکار ئەهێنرێ.
ژنی جوان یان کرداری هەردیارە؛ پاك‌بەو مەترسە؛ کرداری جوان لای خواوەیە.
(بڵگە)

*
Used to describe how nice a woman looks or behaves. Rhet. s. /T. Gold does not care for the mud (in which it is buried); or Mud does not harm gold. i.e. Be true and fear not. E.E. (a) A clear conscience laughs at false accusa-

tion. (b) A good conscience is a soft pillow.

(c) A good conscience is the best divinity.

(d) A good conscience is a continual feast.

ئاڵچاخ (ئان)
نزم؛ بێ نرخ (مرۆڤ)؛ سووك و چرووك؛ ڕسوا؛ پایەنزم (مرۆڤ)؛ بەدخوو.

●
Mean, vile, paltry, undignified, men of the lowest class, inferior (in character).; adj.

ئاڵخواج (ن)
ب (ئاڵخواج).

●
see (alxwac); n.

ئاڵدووز (ن/ئان)
ڕووکەش کراو بە زێڕ (بۆ جوانیی).

●
Coated with gold - leaf, over layed with gold (so as to look more attractive).; n.; adj.

ئاڵدووز کردن (کتپ)
١ . ڕووکەش کردن بەزێڕ (شت).
٢ . ڕازاندنەوە؛ شەوق پێ هەڵێنان؛ هێنانە باقوبریقە.

●
1 . Coat with gold - leaf, overlay with gold.
2 . Adorn, make bright, make lustrous (or glossy and sheeny); vt.

ئاڵشت کردن (کتپ)
ئاڵوگۆڕ کردن (شت)؛ داویسەن؛ شت بەشت گۆڕینەوە.

●
Barter with, make barters, barter away, bargain away, give in exchange; make a bargain with a.o.; vt.

ئاڵشك (ن)
زوقم؛ شەختە؛ شەونمی بەستوو.

●
Frost, rime, hoar - frost, frozen - dew, white - frost; n.

ئاڵف (ن)
ب (ئالیك).

●
n. see (alik); n.

ئاڵفجار (ن)
ب (ئالیك/٢).

●
see (alik/2); n.

**ئاڵقە لە گوێ** (ئانل/ن)
١ . ئەڵقە لە گوێ؛ گوێ لە مست؛ بە یەکێ ئەووتریَ ئەڵقەی کۆیلەیی لە گوێدابێت.
٢ . بەندە؛ بەنی؛ بەنە؛ کۆیلە، زەرخرِی؛ بەزێرکرِراو؛ کەنیز؛ نۆکەرێکی گوێ رِایەڵ.
٣ . خۆفرۆش (بەبێگانە) [ن/ئان].

*
1 . Hench - man, obedient servant, compliant, submissive; subservant, said of one who wears the ear - ring of slavery; c. adj.
2 . Bond - man, bond-slave, bond - servant, helot, thrall, vassal, peon, serf, captive, a very loyal slave; n.
3 . Mercenary, hireling, venal, myrmidon; Hessian; n.; adj.

**ئاڵك** (ن)
١ . ب (ئالیك).
٢ . ئاڵوو؛ ئاڵنگە؛ ئاڵگە.

*
1 . see (alik); n.
2 . Tonsil, gland; n.

**ئاڵکاو** (ئان)
ب (ئاڵۆز/١)

*
see (aloz/1); adj.

**ئاڵگۆن** (ئان)
١ . پەمەیی؛ رِەنگە سوور.
٢ . دڵ پرِ لە ئاوات
٣ . گەشەدار؛ رِوومەت ئاڵ (لە خۆشیدا).

*
1 . Roseate, red, rosy (colour), rosecoloured; adj.
2 . Hopeful, auspicious, red - letter.
3 . Blushing, flushed, blooming; adj.

**ئاڵو باڵو** (می/ن)
جەنانیر؛ جۆرە گێلاسێکی دەنك وورده.

*
Cherry, cherry - plum; n., fru.

**ئاڵو بەلاڵووك** (می/ن)
بەلاڵووك؛ هاڵوبەلاڵووك.

*
Morello, amarus, small bitter cherry; n., fru.

**ئاڵ و بۆڵ** (ئانل/خ)
١ . بەرسیلەی نیوە گەیشتوو؛ چۆنیەتی بەرسیلە کەدەنکە دەنکە شیرین بووبێ.
٢ . نیوە گەیو؛ نیوە پێگەیشتوو (میوە).
٣ . دەستە کچ؛ دەستەکورِ (منال لە تەمەنی نۆودەساڵیدا) [خ].

*
1 . Almost but not enough ripe (grape), half green and half ripe (grapes); c. adj.
2 . Almost matured, about to grow ripe; adj.
3 . Half - grown, teenage, in one's teens; metaph.

**ئاڵ و گۆڕ کردن (کتپ)**

١ . ب (ئاڵشت کردن).

٢ . شت گۆڕینەوە (بە شتێ لە چەشنی خۆی)؛ شتێ بە شتێ دان؛ ساقی و باقی کردن؛ سەربەسەر کردن (شت)

2 . Give (goods or services) in return for other goods or service, give in exchange for; vt.

٣ . شت گۆڕینەوە (بەشتێکی تر)؛ هاڵو گۆڕ کردن (شت بە شتێکی تر).

3 . Change a thing for another, give up for alternative; vt.

٤ . شت وەرگرتن لە باتی شتێکی تر؛ شت گۆڕینەوە؛ دانی شتێك لەباتی شتێ بە کەسێکی تر.

4 . Receive a thing in exchange of, receive a thing in exchange for another, change anything, exchange things, give a thing in exchange to any one; vt.

٥ . جێ گۆڕکێ کردن (شت)؛ شوێن گۆڕکە کردن؛ گۆڕین و گوێزانەوە (شتومەك)؛ گۆڕین و جێگە گواستنەوە (شت)؛ سەر لە نوێ شوێن گۆڕین و جێگە گواستنەوە (شت).

5 . Interchange, permute, do mutual transference; vt.

٦ . چواندن؛ پارە گۆڕ ینەوە؛ پارەوپوول و چەکی بانق گۆڕینەوە.

6 . Change money, etc., pass in exchange, exchange; vt.

**ئاڵوو (ن)**

ب (ئاڵك/١)

●

see (alik/1).

**ئاڵقە (ن)**

●

١ . ئەڵقە؛ حەڵقە؛ عەڵقە؛ ئاخڵە؛ بازنە؛ تەوق؛ خڕ؛ خەڵەك؛ کەمە؛ گرد؛ گەو؛ گردەڵە؛ چەمەر.

1 . Circle, round, circlet, corona, hoop, randure, band, gyre, ring, whorl, girdle; n.

٢ . مستیلە؛ ئەموستیلە؛ ئەنگوستیلە.

2 . Ring (of metal), finger - ring; n.

٣ . کۆمەڵە؛ دەستەکۆمەڵە؛ کۆڕ؛ ئاپۆرە؛ هۆرگە؛ کۆیخەڵك لە دەوری کەسێ یاشتێ؛ گردەوەبوو (کەسان).

3 . Clique, junto, coterie, cabal, leage, gang, confederacy, circle of persons, circular group of persons; n.

٤ . قوڵف؛ دەسك؛ جێ‌دەس (قوری؛ کووپ..).

4 . Haft, halve, stock, handle (of pot, cup, etc.); n.

**ڵ و واڵا (ئاتل)**

١ . ئـاڵا و واڵا؛ زەرقیی؛ ئـاڵایی؛ ڕەنگاوڕەنگ؛ ڕەنگامە؛ هەمەڕەنگ؛ زەرد و سوور.

٢ . ڕازاو؛ خەملاو؛ جوانکراو.

*

1 . Many - coloured, variously - coloured, multicoloured, diversified, dappled, of different colours, pied, many - hued, divers - coloured, pepper - and - salt, of all manners of colours, polychromatic, variegated, party - coloured, motely, mottled; adj.

2 . Decorated, ornamented, beautified; adj.

**ڵووچە (ن/می)**

ئەلووجە؛ ئەڵـووژە؛ ئەڵلو؛ مـولیچکە؛ حەلووك؛ هەڵووژە؛ هەڵۆژە.

*

Plum, yellow plum, mirabelle, n.; fru.

**ڵووله (ن، ئان)**

١ . کۆڵانی بەسراو؛ کوێرە کۆڵان؛ باریکە کۆڵانی بەستراو.

٢ . بێ ئابڕوو؛ بێ شەرم (ئان).

*

1 . Cul - de - sac, blind alley, pocket, impass; n.

2 . Shameless, impudent, immodes; adj.

**ڵۆز (ئان)**

١ . ئاڵکاو؛ ئاڵۆسکاو؛ شێواو؛ تێکچوو؛ تێکاڵاو (دەزوو. . . تاد)؛ بەیەکداچوو.

٢ . شانە نەکراو (قژ یان پرچ)؛ ئاڵۆزاو؛ تێکاڵاو (قژی سەر).

٣ . بێسەروبەر؛ نائاسایی (خ).

٤ . تووڕە؛ تڕزۆ؛ تووڕە و تڕزۆ؛ توند؛ قینگرتوو؛ زویر؛ زوێر؛ مات؛ دڵتەنگ.

٥ . مۆلەکە.

٦ . وەیشوومە؛ باران و تۆف (ن/ئان).

٧ . یاخی؛ سەرکێش؛ نارەحەت.

٨ . تێوەگلاو؛ تێوەئاڵاو؛ تێوە پێچراو (خ).

*

1 . Entangled, tangled, snarly, snarlled, twisted (thread); adj.

2 . Uncombed (hair or tresses), left unstraightened up (hair); adj.

3 . Intricate, unusual; uncommon, complicated; Metaph.

4 . Petulent, waspish; irascible, jumpy, easily - upset; offended, vexed, upset, displeased, provoked, harassed.

5 . Unsteady, unstable; adj.

6 . Gusty, stormy; gust, burst of rain with a strong rush of wind; n.; adj.

7 . Contumacious, recalcitrant, disobedient, refractory, anomolous, out of the way; adj.

8 . Involved in, entangled in, perplexed, in trouble; Metaph.

٩ . سەرماو وەیشوومە؛ ڕۆژی سارد و کڕێوە (نل).

9 . Very severe weather, a squally and cold rainy day, bad weather; c.n.

١٠ . لێڵ؛ قوارویی (ئاو)؛ شێلوو.

10 . Roily, muddy, turbid (water), roiled, feculent, dreggy, muddled; adj.

ئاڵۆزان (کتن)

*

١ . ئاڵۆزکان؛ ئاڵۆسکان؛ ئاڵۆزبوون؛ شێوان؛ تێکچوون (بەن؛ دەزوو. . . تاد).

1 . Become entangled, get confused (by twisting or crossing), be intertwined; become intertwisted, get interweaved, become twisted (thread.....etc), get snarly, become snarlled; vi.

٢ . شێوان (دۆخی دەروون)؛ تێکچوون (بار و چۆنیەتی کەسێ)؛ شێواندن؛ تێکدان.

2 . Perplex, embarrass, puzzle, encumber, ensnare, nonplus; vi.; vt.

٣ . تووڕە بوون؛ زوویر بوون؛ هەڵچوون؛ دڵگیر بوون.

3 . Get angry, get out of humor, become out of tune; vi.

٤ . تووڕە کردن؛ زوویر کردن؛ دڵگیر کردن (کتپ).

4 . Anger, offend, displease, provoke, exasperate, make angry; vt.

ئاڵۆزکان (کتن؛ کتپ)

*

ب (ئاڵۆزان/١، ٢، ٣، ٤).

see (alozan /1,2,3,4); vi.; vt.

ئاڵۆزکاو (ئان)

*

ئاڵۆسکاو (دەزوو. . . . تاد)؛ ئاڵۆزاو؛ ئاڵۆز؛ تێکالاو؛ لوول بادراو بەسەریەکدا.

Entangled, confused (by twisting), ravelled, enmashed, intertwisted; adj.

ئاڵۆز کردن (کتپ)

*

١ . ئاڵۆزاندن؛ ئاڵۆسکاندن؛ تێکەلاو کردن.

1 . Intertwist, entangle, tangle, mat, rovel; vt.

٢ . شێواندن؛ شێوانن؛ تێکدان؛ بێ سەرو بەر کردن (کتپ).

2 . Confuse, disorganize, derange, disarrange, put out of order, throw into disorder; vt.

٣ . ب (ئاڵۆزان/٤).

3 . see (alozan/4); vt.

ئاڵۆزیی (ن)

*

١ . بێ سەروبەریی؛ تێکەڵ و پێکەڵیی؛ شێواویی.

1 . Disorganization, disorganizing, deranging, disarrangement; n.

٢ . زویری؛ پەستی (ن).

2 . Offence, displeasure, wrath, indignation, pique; n.

٣ . تووڕەیی؛ تڕزۆیی؛ توندیی؛ توونیی؛ تووڕە و تڕۆیو .

3 . Anger, rage, frenzy, resentment, ire, gall, exasperation, choler; bile; n.

**ئاڵۆس (ئان)** *

١ . خراپ؛ نالەبار؛ بەد.

1 . Evil, noxious, mischievous, bad.

٢ . بۆگەن؛ گەند؛ گەنگ.

2 . Smelling bad, emitting a stench, having offensive odor or bad smell; adj.

**ئاڵۆسکان (کتن)** *

١ . ب (ئاڵۆزان).

1 . see (alozan); vi.

٢ . رەنگ هەڵبزرکان؛ رەنگ تێکچوون (دەموچاو)[بە هۆی ماندویەتیی یان برسێتیی].

2 . Change colour, to be changed by fatigue and disfigured by hunger (face), get bloodless, become sickly, get pale (face); vi.

**ئاڵۆسیی (ن)** *

خراپیی؛ نالەباریی؛ نزمیی (نەریت).

Badness, wickedness, viciousness, baseness; n.

**ئاڵۆش (ن)** *

١ . خوروو؛ خارشت؛ خورووی پێست (بێ ئەوەی زیپکەی پێوە بێ).

1 . Itch, an itching skin (without visible eruption); n.

٢ . هەکە (نەخۆشیی).

2 . Psora, prurigo, puritus; n. dise.

٣ . ئارەزوو؛ هەوەس بۆ جووت گرتن (ژن یا پیاو).

3 . Teasing desire, uneasy hankering, importunate craving, carnal desire to sexual passion, voluptuous desires, lust; n.

**ئاڵۆشاویی (ئانج** *

١ . ئاڵۆشدار؛ شتێ لەش بهێنێتە خوروو؛ شتێ ئاڵۆش پەیدابکا (ئاڵۆشی بێ).

1 . Itchingsome, having an itching sensation; adj.

٢ . خونك؛ بەرگەرم؛ سەرگەرم (بۆ جووت گرتن)؛ بە ئاڵۆش (کەسێ)؛ ئاڵۆشدار (ژن).

2 . Lustful, sexy, full of sexual desire (one), a voluptuous woman; adj.

**ئاڵۆشدار (ئان)** *

ب (ئاڵۆشاوی ١و٢).

**ئاورنگ دەردان (کتن/کتپ)**
ئـارەق دەردان؛ ئاودەردان (لـە شێوەی ئاورنگدا)؛ شێ دەردان.

Sweat, perspire, emit moisture; vi; t.

**ئاوریشم (ن)**
ئارموش؛ ئارمیش؛ هەرموش؛ هەورێشم؛ هەڤرمش؛ سرگ؛ سرك؛ هـەڤرووشم؛ ئاڤرمییش.

Silk, serge; n.

**ئاوریشمی بەردین (نل)**
ئەسپەست؛ ئەزبێز؛ بەردە هەورێشم.

Asbestos; n.

**ئاوڕژاندن (کتپ/ئد)**
١ . ئاوڕشتن.

1 . Pour forth water, let flow (water) by decanting; vt.

٢ . ب. (ئاوێکی خراپی ڕشتووە/١).

٣ . ڕەنگ ڕژاندن؛ ڕەنگ ڕشتن.

3 . Colour, dye, paint; vt.

٤ ڕەنگ دارشتن؛ ڕەنگ ڕشتن (بناغەی خانوو) [ئد].

4 . Distinguish by a mark, mark out ground works for building; id.

**ئاو ڕووناکی‌یە! (رس)**
کاتێك ئاو لەدەستی یەکێك دەڕژێ بە شتێکی ئەنجام باش دەزانرێ و دەربڕینی ئەم ڕستەیەش بۆ دڵنەوایی‌یە.

Rhet. s.T. Water is light (or good omen). i.e. When water is poured out, it is considered as good omen, and the sentence is cited as an excuse.

**ئاوڕوونکەرە (ن/جر)**
ئـاووڕۆشـنـکـەرە؛ ئـاوڕوونـکـەرەوە؛ ئاوەڕوونکەرە؛ کێچەئاوییلە.

Naiad, hydrometra, water skipper, water - spider; n.; ins.

**ئاوڕێژ (ن)**
١ . تاڤگە؛ تاف؛ قەڵبەز؛ تافگە؛ قەڵوەز؛ قەڵموزە؛ سۆلاف؛ سوولاف؛ شۆش؛ شۆراو؛ شیپ؛ ڕێژاو؛ کەڵپەز.
1 . Water-fall, fall, cataract, linn, cascade; n.
٢ . ئاوەڕۆ؛ دەراو؛ کەردوو؛ ڕێژگە.
2 . Gutter, conduit, kennel, culvert, sewer, water - way; n.
٣ . ئاوەڕێژ ؛ ئاوڕێژگە.
3 . Water shed, a ridge of high land.... etc; n.

**ئاوڕێژگە (ن)**
ب. (ئاوڕێژ/٣).

**ئاوڕێژن (ئان/ن)**
ئاڤڕێژن؛ سەربەرەوژێر (زەوییەك ئاوی لە سەر ڕانەوەستێ).
Slope, sloping, declivity, descent, declivous, descending, downward slope; adj.; n.

**ئاوڕێگە (ن)**
ڕێگەی ئاو؛ ڕێگە ئاو؛ هەچ ئاوێك پانایی و قووڵیی بۆ هاتوچۆی بەلەم و پاپۆڕ دەس بدات.
Water - way, water - route, water wide and deep enough for boats, ships,... etc.; n.

**ئاوڕیش بوون (کتپ/کتن)**
١ . بەڕیشەوە بوون، تووش بوون (چورتم).
1 . Involve in, be involved in, be entangled in trouble; vi.
٢ . بەرەنگار بوون؛ بە گژداچوون؛ دەگژ ڕاهاتن؛ چنگ لێك قایم کردن؛ پڕ بە یەکدا کردن؛ بەگژدا هاتن؛ عەمباز بوون (یەکتر).
2 . Be hand to hand (said) of fighting), be close quarters (of fighting), come to hand-grips, engage in hand to hand fighting, start a quarrel with hand to hand, act directly against each other, attack; vt.; i.

**ئاوزا (نك)**
١ . ئاوزە؛ ئاوزێ؛ جاوزا؛ هەڤالزا؛ هەڤالجێوك؛ جێوك؛ جمك؛ دوانە؛ دوومنداڵ کەبەسکێك بووبن لە دایك.
1 . Twins, two that have been born at the same birth; n. pl.
٢ . ب. (ئاواڵ/١).
2 . see (awal/1); n.

**ئاوزان (کتن)**
١ . ئاوزیان؛ ئاوزین؛ ئاووزیان؛ لە ووزەدا بوون؛ توانین (بۆ کردنی کارێك)؛ تاقەت لێ بوون؛ تاقەت هەبوون؛ قووەت بەسەر (شتێکدا) شکان.
٢ . پێ گەیشتن.
٣ . زانین (کتپ).
٤ . توانین (کتپ/کتن).

●
1 . Be within the capacity (of), have capacity to do s. th., be able, be in a position to do s. th, have power to do s.th., can, be able to; vi.
2 . Become of age; vi.
3 . Comprehend, grasp (mentally), understand fully; vt.
4 . Be able to do s.th., have power to do a thing, can; vt.; i.

**ئاو زاینەدەم (کتن)**
دەم ئاو کردن؛ ئاو تێ زان (دەم).

●
To water (mouth), secrete, fill with saliva (mouth); vi.

**ئاوزنگ (ن)**
ئاوزینگ؛ ئاویلکە؛ گیانەلاّن؛ سەرەمەرگ؛ دوا هەناسەی ژیان؛ ئاوەزینگ.

●
Moment of death, agony, pangs of death, anguish of the soul, last breath of life; n.

**ئاوزەنگی (ن)**
ووزەنگی؛ ویزەنگی؛ زەنگۆ؛ ڕکێف؛ ڕکێو

●
Stirrup (of a horse saddle); n.

**ئاوزەنگی پیاهێنان (کتپ/کتن).**
١ . ئاوزەنگی پێداهێنان؛ ئاوزەنگی پیادا هێنان؛ ئاوزەنگی تێ تەقاندن.
٢ . پاڵ پێوەنان بەرەوپێشەوە.
٣ . بەرەوپێش ڕۆیشتن؛ پێشکەوتن؛ بەرەو پێشەوە چوون.

●
1 . Prick with the spur, gallop; vt.; i.
2 . Press forward, urge forward; vt.
3 . Go forward, go ahead, go on, advance; vi.

**ئاوزەنگی تێ تەقاندن (کتن/کتپ)**
ئاوزەنگی لێدان؛ دانە چوارناڵە؛ ڕکێفکوتان؛ دانەغار؛ غار پێ کردن؛ ولاّخی زین لەسەرپشت لێخوڕین.

●
Go at a gallop, ride at a gallop, put spurs to; vi.; t.

**ئاوزەنگیدار (ئان)**
پشتی پێ قۆقز.

*
Having curved feet (one); adj.

**ئاوزەنگیی داگرتن (کتن/کتپ/ئد)**
١ . سم چەقاندن (ولاخ)؛ پێ لە ئاوزەنگیی توند کردن و قورسایی خستنەسەری بۆ راوەستاندنی ولاخ.
٢ . پێداگرتن لەسەر قسەیخۆ؛ سووربوون لەسەر قسەی خۆ (کەسێ)؛ پێ لێ کردنەکەوش؛ پێ چەقاندن؛ پێ لێ دان بە ئەرزدا؛ پێ لێ داگرتن (ئد).

*
1 . Press stirrup of a horse saddle to control or check the horse; vi.;t.

2 . Demand persistently, maintain persistently, insist on or upon, take and maintain a stand, make a firm demand; vi.; id.

**ئاوزەنگیکوت (ئاڵ/ن)**
١ . ئاوزەنگی تەقین؛ چوارناڵە؛ رکێف کوت؛ ئاوزەنگی لێدانی یەك لەسەر یەك بۆ ئەوەی ولاخەکە بداتەغار.
٢ . خێرایی؛ تێ قاچان؛ تێ تەقان؛ کاری خۆ هاویشتن (رۆیشتن بەرەو پێشەوە بە خێرایی)[خ].

*
1 . The fastest gait of a horse, succession of pressing stirrup of a horse saddle to both sides of the horse to cause to gallop, succession of leaping strides with all the feet off the ground at one time (horse), at a gallop (scampering, going or riding) adv.

2 . Speed, despatch, swiftness, fleetness; n.; Metaph.

**ئاوسان (کتن)**
١ . ئاووسیان؛ ئاوسیان؛ پەنمان؛ ئاماسیان؛ ئاماسان؛ ئەستوور بوون؛ بەل بوون؛ پەنمیان؛ هەڵپەنمان.
٢ . هەڵاوسان؛ هەڵامسان؛ هەڵسان.
٣ . برژاننەوە؛ سووتانەوە.

*
1 . Swell, dilate, distend, expand, belly, bulge, bloat, inflate, intumese, grow larger, grow bigger, surge, puff, tumefy, protuberate; vi.

2 . Put on airs, be puffed up, strut, be turgid, increase (by outward addition), enlarge, augment (in size), grow big, be flatulent; vi.

3 . Have clonus; vi.

ئاوساندن (کتپ)
هەڵئاوساندن؛ پەنماندن؛ باتێ کردن؛ هەڵپەنماندن.

*
Puff up, inflate, dilate, enlarge, sufflate; vt.

ئاوساو (ئان/خ)
١ . پەنماو؛ ئاوساگ؛ ئاوسیاگ؛ ئاماسیاگ؛ هەڵاو ساو؛ هەڵساو؛ هەڵکفاو.
٢ . ئاوساو؛وەرس؛ وەرز؛ بێزار؛ پەست؛ ماندوو؛ هیلاك (خ).
٣ . گەورە؛ زرتەبوز؛ زەبەللاح (ئان).

*
1 . Swollen, tumescent, inflated, bloated, puffing, surging, protuberant, turgid, tumefied, intumesced; adj.
2 . Bored, vexed, annoyed, upset, fatigued, exhausted, tired out; adj.; Metaph.
3 . Large, corpulent, obese, portly, chubly, thick -set; adj.; Metaph.

ئاوساوی (ن)
ئەستووریی؛ گرێ.

*
Callus, callosity, flatulence; n.

ئاوسەرکەم (ئان)
١ . ب. (ئاتاج).
٢ . داماو؛ بێ دەر؛ بێ دەرمتان؛ بێ دەرومال؛ بێ نەوا؛ بارچەوت؛ بارکەوتوو.
٣ . بەلەنگاز؛ بێباڵ؛ برەش؛ بێکەس؛ بابدەست؛ کەرەواڵە؛ رەبەن.

*
1 . see (atac); adj.
2 . Desperate, helpless, powerless, resourceless, prostrate, wealthless, needy; adj.
3 . Miserable, wretched, unfortunate, luckless, ill - fated, ill - starred, unlucky, unhappy, pitable, despondent, calmitous, deplorable; adj.

ئاو سەرکەوتن (کتن)
ئاو داپۆشین؛ بن ئاو کەوتن؛ ژێر ئاو کەوتن؛ ئاو پۆشین.

*
Plunge, to be plunged into water, to be drowned, be sunk under water, be dipped under water; vi.

ئاوسێتی (ن)
١ . دراوسێتی؛ دەراوسێیەتی؛ هاوسێتی.
٢ . نزیکی؛ نیزیکی؛ نیزیکاهیی.

*
1 . Neighbourhood, vicinity, vicinage, proximity; n.
2 . Nearness, propinquity, closeness, adjacency; n.

**ئاوشار** (ن) *

ب . (ئاوڕێژ/١).

**ئاوفڕێدان** (گ.ن) *

ڕەحەت بوون (لە کاتی جووت گرتندا)؛ بوون.

Have a sexual orgasm, come; vi.

**ئاوقەدبوون** (کتن/کتپ) *

١ . ئەوقەد بوون؛ ئەنباز بوون؛ عەمباز بوون؛ ئەمباز بوون؛ پەلاماردان و پێداهەڵزنیین.

1 . Embrace, pounce upon, attack a.o., rush upon, attack a.o. with a rush; vt.

٢ . تووش بوون؛ دووچار بوون؛ گرفتار بوون (کتن)

2 . To be entangled, become intricate, get embraced, involve; vi.

٣ . چاو پێ کەوتن؛ هاتنەرێ؛ تووش‌هاتن؛ تووشیار بوون؛ بینین (کەسێ) بەرێکەوت.

3 . Come to pass, come about, encounter by chance, fall upon s.o. unintendedly, come upon a.o. by chance, see a.o. incidentally; vi.

(١) **ئاوکردن** (کتن) *

١ . ئاو یا زنچکاو پەیدا بوون (لە برین و دوومەڵ. . . تاد)؛ جەراعەت کردن.

1 . Contain (a clear) watery fluid (wound, ulcer....etc.), generate pus vi.

٢ . ئاوزاینەچاو؛ چاو پڕ لە ئاو بوون؛ چاو پڕ بوون لە ئاو؛ فرمێسك زاینەچاو؛ فرمێسك کردن.

2 . Fill with tears (said of the eyes); vi.

٣ . ب . (ئاوتێزان/١).

(٢)**ئاو کردن** (کتپ) *

ئاو پێدا کردن؛ ئاو پرژێن کردن؛ ئاو لێ پرژاندن؛ ئاو پرژاندن (لە هێندێ شت بۆ نەرم کردنەوە).

Sprinkle, be sprinkle, damp, wet, moisten, bedew; vt.

**ئاوکردنە ژێر** (کەسێ) [کتپ/ئد] *

١ . دەربەڕاندن؛ دەرکردن؛ ڕادان؛ ڤاودان

1 . Lit. Pour water under s.o., i.e. force sb. to

(کەسێ بە دەسیسە و بۆ مەبەستی ناو زڕاندن).

leave often by a conspiracy to damage his good name, drive out s.o., drive away, drive off, hound out, hound out of. vt.; id.

٢ . جێ پێ لێژ کردن؛ ناڕەحەت کردن؛ تووش کردن؛ ئەزیەتدان (کەسێ) بە پەنهانیی.

2 . Impair by subtle means, wear away at the base, injure by stealthy means; vt.; id.

٣ . تەفرەدان؛ گزی لێ کردن؛ داونانەوە (بۆ کەسێ).

3 . Guide astray, deceive, involve in conradiction, mislead, delude, misguide, catch in difficulties; vt.

**ئاوکێش** (ئان)

●

١ . ب. (ئاوبەر).

1 . see (awber); adj.

٢ . خواردنێ ئاوی زۆر بە سەردا بخورێتەوە (ئان/ن).

2 . Thirst stimulant food; adj., n.

٣ . کەلوی ئاوکێش؛ بورجی ئاوکێش (ئلس).

3 . Aquarius, the waterman, the water bearer; astron.

**ئاوکێشان** (کتپ)

●

١ . ب. (ئاو چنین/٢).

٢ . ئاو بردن؛ ئاو گواستنەوە؛ ئاو کێشی کردن؛ ئاو هاوردن؛ سەقایی کردن.

2 . Carry water, convey water, transport water. vt.

**ئاوگر** (ن)

●

ئەنباراو؛ عەماراو.

Cistern, rescrvoir, barrage, tank for water.; n.

**ئاوگرتن** (کتپ/کتن)

●

١ . ب. (ئاو تێ زان/٣).

٢ . ئەنبار کردن (ئاو) بۆ بەکارهێنان.

2 . To store water (in a large receptacle) for use; vt.

٣ . ئاو گوشین؛ ئاوی میوە گوشین.

3 . Squeeze (fruits, grapes,...etc.), express the juice of fruits (grapes or any other fruits...etc.); vt.

٤ . ئاودان (کشتوکاڵ).

4 . To water a land, farm out (a land); vt.

٥ . کێم کردن (برین).

5 . Form pus (wound); vi.

**ئاوگردان (نل)**
کەوچێز؛ چەمچەی قوووڵ و دەسك درێژ بۆ هەڵێنجانی ئاو یا شلەمەنی.

Ladle, a long - handled spoon for dipping out water, liquids....etc.; c.n.

**ئاوگیر (ن)**
١ . ئەستێرك؛ بەست؛ گۆم؛ گۆلی قووڵ؛ چاڵاو؛ زەلکاو.
٢ . کۆتەڵ؛ ئەو شوێنەی باراناوی تیادا کۆ دە بێتەوە و دوایی بەکار دەهێنرێ.

1 . Lake, lock, pond, pool, mere, tarn; n.

2 . A place where rain water is collected for use; n.

**ئاوگیریی کردن (کتپ)**
بەرقلیان کردن؛ قلیان قاوەڵتی کردن؛ (شتێکی کەم) خواردن بۆ لابردنی برسێتی (کاتی چێشتەنگاو).

Take a light meal, eat a lump of bread etc. between breakfast and dinner, take a light lunch; vt.

**ئاو لە ئاوەڕۆ بڕان (ئد)**
١ . وشك بوون و بڕانی ئاو لە ئاوەڕۆ.
٢ . کوێربوونەوە (سەرچاوەی خێر)؛ سەرچاوەی سود و هات... کوێربوونەوە (لە کارێك).
٣ . چاوەڕوانی دڵ نەرمی لێ نەکردن؛ میهرەبانی لێ نەوەشاندنەوە (لە کەسێ).
٤ . هیوانەمان؛ بێ هیڤی بوون؛ ئومێد بڕان.
٥ . خراپ بوون (کەسێ)؛ ناڵەبار بوون؛ دەغەزبوون.
٦ . بێ سوود بوون؛ بێ هودەبوون؛ بێ کەڵك بوون؛ لە کەڵك کەوتن.
٧ . لە جێی خۆیدا نەمان (کار، شت، رەوشت)؛ لە جێی خۆیدا نەبوون (ڕووداو).

1 . Lit. Remain no more water in the gutter; id.

2 . Become exiguous (wealth, good turn, profit..); id.

3 . Confer no more a favour on; id.

4 . Lose all hope, give up all expectation, be without any hope, stifle hope; id.

5 . Be ill-qualified, be bad - blood, become hatred; vi.

6 . Be unfavorable, become disadvantageous, be ineligible, become inconvenient; vi.

7 . Be inopportune, be unseasonable, be untimely; vi.

**ئاو لە ئاوەڕۆ کردن (ئد)**
خراپە کردن لە ئەندازەبەدەر؛ ناڵەباری کردن لە ئەندازە بەدەر.

T. Draw back water from channel. i.e. Play the mischief with, misconduct, be immoder-

ate, become intemperate, have unfriendly feeling or behaviour, id.

**ئاو لەبەر دڵ ڕۆیین (ئد)**
*

١ . دڵ تێکەڵهاتن؛ بێز کردنەوە (لە شتێکی پیس).
1 . Shrink from impurity; id.

٢ . زۆر برسی بوون؛ قۆڕەی سك هاتن (لە برسا)؛ ئاو لە دڵڕۆیین؛ هەست کردن بە برسێتی.
2 . Writhe from hunger, to have vehement hunger; id.

٣ . ژیانێکی ناهەموار بردنەسەر؛ ژیان بە کولەمەرگی بردن بەڕێوە.
3 . Live an uncomfortable life financially, lead a miserable life; id.

٤ . حەچولوور کردن لە برسا (سەگ، گورگ، چەقەڵ.. تا) [ئد].
4 . Howl in hunger (dogs, wolves, jackal...etc.) [wild beasts]; id.

**ئاو لە بەر هەڵنیشتن (ئد)**
*

١ . میز بە خۆدا کردن (منداڵ)؛ میز ڕانەگرتن؛ ئاو لە بەر چوون.
1 . Discharge urine unconsciously (child), piss or urinate (child wetting himself ignorantly); id.

٢ . ئارەق کردنەوە (زۆر).
2 . Give out sweat to an abnormal degree; id.

**ئاو لەجێ ماڵی (کەسێ) نان [ئد/کتێپ]**
*

١ . ئاو لە ماڵی کەسێ بەردان؛ ماڵی کەسێ وێران کردن؛ تەخت و تاراج کردن (ماڵی یەکێ).
1 . Bring some one's house (or property) to ruin, eradicate s.o.'s house, destroy s.o'.s house. Lit T. Bring water to the foundation or location of one's house; id.

٢ . تووش کردن؛ تەنگەو چەڵمە هێنانە ڕێ (کەسێ).
2 . Involve s.o. in trouble, to perplex s.o. by embarrassment; id.

٣ . تەنگاو کردن؛ تەنگەتاو کردن؛ لێ تونگ کردن؛ لێ هەڵپێچان؛ هەراس کردن.

3 . Put in a strait, get hemmed in by, act severely towards sb., treat sb. harshly, harass; id. vt.

**ئاو لە دەستی ناتکێ (ئد/کتن)**

١ . زۆر پیسکەیە؛ بەرچاو تەنگە؛ دەست قووچاوە.

*

1 . T. Water will not drip from his hand. E.E.
(a) He is close - fisted.
(b) He wont give away (or lose) the droppings of his nose.
i.e. He is parsimonious (or close - handed), he is ungenorous; id.; vi.

٢ . بەیەکێکی (دەس گرتوو؛ کنووس؛ چکۆس؛ مەنلەموور؛ رژد؛ چرووك؛ گزاف؛ چەبخووس) دەوترێ [خ].

2 . Used of a (curmudgeonly, stingy, niggardly, penurious, avaricious) person or [narrow - hearted, grasping, hard - fisted, greedy (of gain), sordid] one; Metaph.

**ئاو لە دەسکاوونگا کوتان (ئد)**

ب. (ئاو لە دینگا کوتان).

*

see (aw le dinga kutan).

**ئاو لەدەم زان(گەران) [ئد؛ کتن]**

١ . ب. (ئاو تێزان).
٢ . ئیشتیا کردن؛ دڵ چوونەسە؛ حەز لە شتێ کردن؛ سوێ بوونەوە (بۆشتێ).

*

1.see (awte´zan); id.
2. Covet, desire, long for, aspire to, desire inordinately; vt.

**ئاو لە دینگا (دنگا) کوتان [کوتاندن] (ئد)**

١ . کاری بێ کەڵك کردن؛ رەنجی بێهوودە دان؛کاری بێ ئەنجام کردن.
٢ . لە خۆرازی بوون (دوور لە ژیری‌یەوە).

*

1. T. To bray water in a mortar.i.e to work hard (continuously) in vain; set to work to no purpose (without avail); id.
2. Be wise in one's own conceit ; id.

**ئاو لە سەرچاوەوە لێڵە(رس)**

لەسەرەتایەوە بە خواری هاتووە (کار. . .)؛ بەلا لە سەری گەورەوە دەس پێ ئەکات.

*

Rhet. s.T. The water is turbid from its source. i.e. Trouble starts with those at the head of affairs.

ئاو لەسەر زوڵفی دەتکێ (رس)
١ . گەنج و جوانە؛ جەرگەیە!

●
1. Rhet. s.T. His or her ringlet is dripping. i.e. He or she is pretty little. (or comely, graceful); metaph.

٢ . بە گەنجێکی (قشتیلە؛ نەشمیل) دەوترێ [خ].

2. Uesd of a (moderately beautiful, pretty, effectedly nice, beauteous, elegant) youngster; Metaph.

ئاو لە سەر من تێپەڕی، چ یەك گەز، چ سەد گەز (پن)
من کەتیا چووم، لەسەر یەك بوختان پێ یان سەد، چوون یەکە.

●
Pvb. T. when the water rises above my head, one ell is the same as hundred. i.e. As well be hanged by the neck for one accusation as for hundred criminations. E.E. As well be hanged for a sheep as for a lamb.
The proverb is quoted as an excuse for indulging in further wrongdoing once one has committed a minor offence.

ئاولەمە (ن)
١ . پیزە؛ منداڵ (کە هێشتا لە سکی دایکیدابێت).
٢ . منداڵی لەبار چوو.

●
1.Fetus, foetus, embryo, foetus not get complete; n.
2. Abortive foetus, cast off embryo, the offspring in the womb being miscarried before its later stages; n.

٣ . ئاولەمە؛ پس؛ پز؛ بێچووی ئاژاڵ کە دایکی سەربرابێت و لە سکی دایکی دەرهێنرابێ.

3. The unborn young of an animal when its mother killed and taken out from the uterus; n.

٤ . بێچوو؛ بێچوولە؛ بەچکە؛ وەڵە؛ بەر (ئاژاڵ).

4. Issue, offspring, progeny, brood, litter, yong (of animals); n.

٥ . منداڵ؛ کۆرپەلە؛ ساوا؛ بەرمەمکانە.

5. Baby, babe, brat, bantling, nursling, suckling, infant-child, chit; n.

٦ . بەرخۆلە (ن)

6. Lamb, a young sheep; n.

ئاولێ (له کارێك) نەخواردنەوە (ئل)
دریغی نەکردن...؛ دەست‌نەگێرانەوە و چوونە پێشەوە بۆ کردنی کارێك.

●
Save no effort to do a.th. or s.th., confine one's self exclusively to do s.th. id.

ئاو لێ چوون (کتن کتپ)
ئاو له بەر رۆیشتن؛ دزەکردن (ئاو) له کونی ووردی دەفرەوە؛ ئاو لێ رۆیشتن.

●
Infiltrate, ooze, exude water, come out through the pores (water.... etc;; vi.; t.

ئاولاوی (ئان)
کونج؛ دەموچاو کونج؛ کەسێ تووشی ئاوله بووبێ.

●
Pustulant, pock - marked, attacked by small pox, afflicted by variola; adj.

ئاوله (نخ)
هاوله؛ هەموله؛ هەلۆی؛ خرووکە؛ خورییك؛ خروێلکە؛ خوریکە؛ خریی.

●
small - pox, variola; dis.

ئاوله دەردان (کتن)
تووشی نەخۆشیی ئاوله بوون.

●
To be afflicted by small-pox, to be attacked by variola; vi.

ئاولەی مانگا (نخ)
ئاولەی رەشەولاخ.

●
Cow-pox, glaucin; dis.; n.

ئاولەی ولاخ (نخ)
ئاولەی ولاخی بەرزە (ئەسپ... تاد).

●
Horse - pox, vaccina; dis.; n.

ئاومال (ن)
١. ب. (ئاو مالك).
٢. ئاوسێ؛ هاوسێ؛ هاومال؛ هامسا؛ هەمسایە؛ ئەوکەسەی له نزیك یەکێکی ترەوە دەژی.

●
1. see (awma'lk).; n.
2. Neighour, a fellow-man, a house or a thing situated near another, a person who lives near another; n.

ئاومالك (ن)
ئاومالە؛ ئاومال؛ کۆتەرەدارو پووش و

●
Litters, lumps of woods, etc.... carried down

پەلاش؛ پووش و پەلاش و کۆتەرەدار. . . . تاد. لە گوێ ئاوو چەم بەجێماو.

by a torrent, scum and rubbish swept by a torrent; n.

**ئاوەل (ن)**

١. هاوەل؛ هاوسەر؛ ژن؛ مێرد.
٢. هاودەم؛ هاوراز.
٣. هاوجووت؛ هاونیلە؛ هاوەل (گا).

*

1. Spouse, consort, mate, husband or wife; n.
2. Companion, confident; n.
3. Span, yoke-fellow, a team of two animlals used together; n.

**ئاوەل کردن (کتپ)**

هاوجووت کردن (دوو گاجووت، دوو ئێستر. . .)؛ هاونیلە کردن؛ هاوەل کردن؛ دوو ولاخ بە یەکەوە بەستن.

*

To span, unite, yoke together in a team, harness together in a team, haul with a team; vt.

**ئاوو ئاو چێت! (ئد)**

برواو نەیەتەوە؛ چوونی بێ و هاتنەوەی نەبێ؛ تووشی تەنگە و چەلەمەیەك بێت رزگاریی لە دوانەبێ. واتە: بمرێ؛ لەوەلاترچێت!؛ بچێتە ریزەی مردوان.

*

T. May he travel from one region (Lit. water) to anothor. i.e. Be numbered with the dead, let him die, may he leave the world, let him be heard of no more, id. F.T. Perdition take him!.

**ئاوو ئاوەدانی یان وتووە (رس)**

ئاونیشانەی ئاوەدانی و نشو نمایە.

*

Rhet.s. T. Water is an indication of habitation and development, where there is water, there is civilization.

**ئاووتاو (نل)**

١. ب. (ئاب وتاب).
٢. داروبەرد؛ کوچك و کەلەك، واتە: هەموو (شت) تاد.

*

1. see (ab u tab); c.n.
2. Trees and stones, pebbles and piles. i.e. All, the whole, totality, everything, c.n.

**ئاوور (ن / ئان)**

١. ب. (ئاگر).
٢. ئاووس؛ سكپڕ (ئان).

*

1. see (agir); n.
2. Pregnant, gravid, great with child; adj

**ئاوورجا (نل)**
ب. (ئاگردان (١).)

•
see. (agirdan (1)); c.n.

**ئاوور (ن)**
١. تەماشا؛ بەر؛ لا؛ سەیر.
٢. ب. (ئاخور).

•
1. Glance, glimpse, sideways, rapid look, backward transitory view; n.
2. see (axu'r); n.

**ئاوور ـدانەوە (کتن)**
١. تەماشا کردن (لەسەر شانەوە)؛ بەر تێ کردن؛ بەری خۆدان؛ لاکردنەوە؛ بە گۆشەی چاو تەماشا کردن؛ لاکردنەوە بۆلای ڕاست، چەپ یا پشتەوە.
٢. سەرنج لێ دان؛ لێ وورد بوونەوە؛ تەماشاکردن؛ تێ ڕامان؛ تێ ڕوانین؛ ڕوانین؛ نوارین؛ تێنوارین (کتب).
٣. ب. (ئاوور لێ دانەوە/١).

•
1. Glance sideways, turn a glance (to the right, left or backward); vi.
2. Pay attention to, give heed to, attend, look at, cast the eye over, look into, inspect closely, observe narrowly; vt.
3. see (awu'r le'danewe/1); vt.

**ئاوور لە کەس ناداتەوە: (رس) [ئد]**
١. گوێ لە کەس ناگرێت.
٢. لە خۆ بایی بوون؛ لە خۆ گۆران؛ خۆ بە شت زانین؛ خۆخۆیی کردن.
٣. دەستی کەس ناگرێت؛ یارمەتیی کەس نادات.
٤. هیچی نەگرتۆتەخۆی؛ هیچی لە خۆی نەگرتووە.

•
1. Rhet.s. T. He does not give careful attention to any one.
2. Be self-conceited, be vain, be overweening, get above one self, be self- esteemed, be self sufficient, be egotistical; id.
3. He is disinclined to aid others, He is unserviceable; id.
4. He does not take charge (or note) of anyone or anything; id.

ئاوور لێدانەوە (کتپ / ئد)

١ . چاودێری کردن؛ بەتەنگەوە بوون؛ مشوور خواردن؛ خەمخۆری کردن؛ لا لێ کردنەوە؛ یارمەتیی دان؛ دەستگرتن.

٢ . بەلوتف بوون لەگەڵ (کەسێ)؛ ڕێزگرتن؛ میهرەبانیی کردن (لەگەڵ کەسێکدا).

●

1. Pay heed to, care for, be beneficent to, attach value to, help, co-operate with, take part with, sustain, aid, lend aid, contribute assistance; vt.;id.

2. Dance attendance on or upon sb., do kindness to, be kind to s.o., have regard for , be kind-hearted to, look up to, think highly of; vt.;i.

ئاووزیاگەی (ئان)

١ . پێگەیشتوو (لە بارەی لەش و ئەندامەوە)؛ پێگەیو؛ پێ گەییگ.

٢ . تواناو بە فام؛ تێ گەیشتوو (مرۆو).

●

1.(One who had) become of age, mature, perfected by time; adj.

2. Of sound judgement (man), of great scope; adj.

ئاووس (ئان)

١ . ئاقس؛ هاوس؛ سك پڕ؛ زگەپڕ؛ باردار؛ تلدار؛ دووگیان؛ تۆڵدار؛ ژن کە منداڵی لە سکدابێ.

٢ . حاڵی دارودرەخت کاتی بوژانەوەو گۆپکە دەرکردن؛ حاڵی دارودرەخت کاتی دار ئاوسان (ن).

٣ . تووڕە؛ شێتگیر (ئان).

٤ . بەدخواز؛ چەبخووس؛ گزاف.

●

1. Pregnant, enceinte, gravid, big, big with child, great with child, parturient, with young, with child, conceived (woman); adj.

2. Trees and bushes that have begun to grow and give off buds, plants that have begun to sprout, gestation; n.

3. In a passion, in a pet, in the tantrums, out of temper, angry; adj.

4. Envious, jealous, grudging, desposed to envy. adj.

**ئاووس بوون (كتن)**
ئاوسين (ژن‌بەمندال)؛ سك پڕبوون.

*

Conceive (a child) [woman], be conceived (foetus), become pregnant with, bear in the womb, be pregnant. vi.

**ئاووس كردن (كتپ)**
١. سك‌پڕ كردن؛ ئاوس كرن (ژن).

٢. چاك كردن (نێر له مێ: ئاژاڵ)؛ چات كردن؛ تێك بەردان (نێر له مێ: ئاژاڵ).

*

1. Impregnate, fertilize, fecundate, conceive, supply with semen, render (a female) pregnant; vt.

2. Put (male) to cover female, cover (male) on female; vt.

**ئاووسە درۆزنە (نل)**
شەیتان ئاووس؛ ئاووس درۆزنە.

*

False - pregnancy, pseudo pregnancy, false conception; c.n.

**ئاووگڵ (نل / خ)**
١. مەرگ؛ ئاكام.

٢. سروشت؛ سرشت.

٣. نیشتمان؛ نیشتگە؛ دیار؛ زید؛ مەڵبەند؛ مەڵوەند.

٤. لەش؛ تەن؛ بەدەن؛ ڕواڵەت؛ كلۆخ.

٥. ئەو شوێنەی مرۆو لێی دەمرێ یالێی دەنێژرێ.

*

1. Death, expiration, demise, dying, end of life, king of terrors; c.n.; Metaph.

2. Nature, universe, creation, world of matter and mind; n.

3. Native-land, Father land, Mother country, One's country, Home, abode, Dwelling, Place of residence; n.

4. Soma, terso (of a man), (the human) body, trunk (as distinguished from the limbs), human being or person; n.

5. Place where one fades out (i.e. demises dies, expires). n.

ئاوو گلّ هەلّی گرت (رس؛ کتن؛ ئد)
١. مەرگ بۆی هات؛ ئاکامی هات (واتە: نەما؛ مرد؛ گیانی‌دابە دەستەوە).

1. Rhet.s. He died a natural death, he is numbered with the dead, i.e. demised, died, expired, deceased, left the world.

٢. گیان سپاردن؛ گیان بەدەستەوە دان؛ دنیا بەجێ هێشتن؛ مردن؛ بەلاداهاتن؛ فەرمانی خودابەجێ‌هێنان؛ لەناوچوون؛ تیاچوون؛ تەفرو تونابوون.

2. Lose life, draw the last breath, leave the world, pay the debt of nature, give up the ghost, shuffle off this mortal coil, decline, fade out, be heard of no more.; vi. ; id.

ئاووگۆشت (نل)
گۆشتاو.

Broth, soup (in which meat has been macerated.; c.n.

(١)ئاوونگ (ن)
هەوونگ: هاوونگ؛ هاوان؛ هاوون؛ هەوان؛ هاڤەنە؛ هۆد؛ ئاوان؛ دەسکەوان؛ دەسکاوونگ؛ جوورهتی.

(1) Morter, vessel for pounding, morter and pestle, trough in which things are pounded or ground.

(٢) ئاوونگ (ن)
ئاڤینگ؛ ئاورنگ؛ خوناو؛ خوناڤ؛ شەونم.

(2) Dew, little drops of moisture on cool surfaces. n.

(٣) ئاوونگ (ن)
مێلاق؛ ترێی مێلاق؛ هێشووی ترێ کەلەشوێنێکدا هەلّی دەواسن بۆزستان.

(3) Clusters of raw grapes suspended somewhere in (an enclosed) place, they are eaten in winter; n.

(٤) ئاونگ (ن)
ب. (ئارنگ).

(4) see (aring). n.

**ئاووهەوا** (ئل)
١. مەناخ.
٢. کەش؛ بینلەر.
٣. جێگا؛ وار؛ هەوار.

1. Climate, clime, usual weather; c.n.
2. Meteorological character; n.
3. Encampment, place, station, halting-place; n.

**ئاوەچۆڕەبوون** (کتن)
نەمان (ئاو بە شتی تەڕەوە)؛ ووشك بوونەوە (لە ئاو).

Drain, become dry, get clear of water or moisture. vi.

**ئاوەچۆڕ کردن** (کتپ)
ووشك کردنەوە؛ شێ یا ئاونەهێشتن بە شتی تەڕەوە.

Dry off, make dry, clear of water or moisture. vi.

**ئاوە چۆڕە** (ئل)
١. کاری تکانەوەی ئاو (لەشتێك کە لە ئاو هەڵکێشراپێ یا زۆر تەڕ بێ).
٢. کاری هاتنە خوارەوەی ئارەق بە لەشی مرۆڤدا (خ).
٣. کاری ووشك بوونەوەی ئاو یان شێ تیادا نەمان.

1. water falling drop by drop from s.th. thoroughly wet. c.n.
2. Sweat given forth in drops through the skin; met.
3. Draining, clearing of water or moistute; metaph.

**ئاوە چۆڕەی هێنایەوە** (رس؛ ئد)
١. هەست و نەست بران؛ ووزەی ژیان نەمان.
٢. شت لێ چوونە قات؛ ژیانێکی ناهەموار (خراپ؛ نالەبار؛ پڕ ئێش و ئازار) بردنەسەر (ئد).

1. Rhet.s. Lose emotional vitality, live on the edge of one's nerves, desiccate.
2. Have a harsh (angular, desiccated, troublesome) existence, lead a miserable life. id.

**ئاوە خۆرە** (ئل)
١. سووریچکە؛ سوورێنە؛ قورگ؛ سوورێنچك؛ کورگ؛ گەروو.

1. Gullet, gorge, aesophagus, throat. c.n.

٢. دانگە؛ قەدی کولۆرکراوی درەخت کە ئاوی تێدا دەخرێتە بەر ئاژەڵ بۆ خواردنەوە.
2. Wooden water trough, water trough made of a hollow tree.

٣. ڕەشمە؛ ڕەشوە.
3.Horse-leash, thong or chain for holding a horse, mule,.... etc., halter, chain of head-piece, thong of head-stall.n.

٤. دەمولچی وڵاخ (ئەو ئەندازەیەی کە لە کاتی ئاوخواردنەوەدا دەیخاتە ناو ئاوەوە).
4. Mouth and both the upper and the under lips of mule, horse... etc., used when drinking water.n.

٥. ڕاوە سەرکانیی؛ ئاوەوەرە.
5. Hunting and shooting where there is a body of water or water-springs. n.

**ئاوەدان (ئان)**
•
١. ئاوا؛ ئاوان؛ ئاڤا.
1. Inhabited, peopled, dwelt in. adj.

٢. پێشکەوتوو (لەبارەی شارستانێتی یەوە).
2. Flourishing, thriving, growing. adj.

٣. فراوان؛ گوشاد؛ گەورەوبەرەڵا؛ پان و بەرین.
3. Roomy, spacious, capacious, wide, large, commodious, comfortable. adj.

**ئاوەدانکردنەوە (کتپ)**
•
١. ئاڤاکرن؛ (سەرلەنوێ) خانووبەرە دروست کردن.
1. Refound or reconstruct houses, re-establish buildings. vt.

٢. دێ بنیات نانەوە؛ سەرلەنوێ کۆکردنەوە و نیشتەجێ کردن لە شوێنێکدا (خەڵك).
2. Re-found village at, re-collect and re-inhabit people in a region (to live in), re-dwell. vt.

**ئاوەدانیی (ن)**
•
١. ئاوایی؛ ئاڤاهیی؛ ئابادیی؛ دێ؛ لادێ؛ دەگا؛ گوند.
1. Quarter, district, village, town, region, territory. n.

٢. قەرەباڵغی؛ چرە؛ کەرەسیسە (خ).
2. Throng, crowd, multitude, horde, concurse. Metaph.

٣. تێروتەسەلیی؛ کامەرانیی؛ کامرانیی.
3. Prosperity, repletion. n.

٤. کۆشك؛ تەلار؛ کۆچك.
4. Mansion, balcony, dwelling house, mansion house.

**ئاوەڕ (ن)**

١. باوەڕ؛ بڕوا؛ دڵنیایی.

٢. ب. (ئاخوڕ).

*

1. Belief, confidence, believing, persuation, conviction, trust, feeling of certainty.

2. see (axurˇ). n.

**ئاوەڕووت كردن (كتپ)**

١. پاك‌كردنەوە (باڵندە لەپەڕ)؛ ڕووتاندنەوە (پەلەوەر لە پەڕو باڵ....).

٢. تووك لابردن (تاشين....)؛ موو ڕووتاندنەوە.

*

1. Pluck, strip by plucking, pull out the feathers of (a fowl). Vt.

2. Shave, cut off, pare close, make smoother, bare (as by cutting off hair closely). vt.

**(١) ئاوەڕۆ (نل)**

ئاوڕێژ؛ ئاوەڕێژ؛ ڕێژگە.

٢. گونج؛ گۆڕیچە؛ ئاوەڕۆگە؛ ئاوڕێگە؛ زێراب؛ زێراو؛ گونجی ئاوی پیس.

٣. دێراو؛ دەراو؛ جۆگە؛ جۆگەلە.

٤. بۆری ئاو یان بە لووعە.

*

(1)1. water-shed, water-parting, catchment area. c.n.

(1).2.Drain, drainage, drain-pipe, water-way, water-course, sewer, cloaca, culvert, subterranean canal. n.

(1)3. Runlet, run, runnel, rivulet, brook, small stream. n.

(1)4. (The distributing) water-pipes, water-taps. n.

**(٢)ئاوەڕۆ (نل)**

١. ئاوەزا؛ ئاوەزێ؛ ئاڤزێم؛ زۆنگ؛ زۆنگاو؛ زەناو؛ زەها؛ زەویی تەڕو نمدار.

٢. تەڕە شوعدار؛ شێدار؛ نماویی (ن/ئان).

(2)1. Swampy ground, marass, slough, quagmire. also: Marsh, fen, bog, mire, swamp, lagoon. c.n.

(2)2. Damp, dampness, dank, wet, humid, moist. n. adj.

**ئاوەڕۆگە (نل)**
ب. (ئاوەڕۆ /٢).

*
see (awer'o /2). c.n.

**ئاوەڕەش هێنانەوە (ئد؛کتپ؛کتن)**
١. دەنگوباسی ناخۆش هێنان بۆ کەسێ؛ نوقلانەی خراپ لێدان.
٢. هیواو ڕووناکیی نەمان؛ پشت پێ نەبەستن..

*
1. Bring bad omen to, abode ill of a thing. id vt.i.
2. Look on the dark side, give no more hope to a thing. id.

**ئاوەڕێژ (نل)**
١. ئاوڕێژگە.
٢. ب. (ئاوەڕۆ).

*
1. The area drained by a river. c.n.
2. see (awer'o). c.n.

**ئاوەڕێس (ئان)**
بارییك (دەزوو.. تاد)؛ باریك ڕێسراو؛ دەزوولەیی.

*
Thin, gossamery, fine-spun, thread like adj.

**ئاوەز (ن)**
ئەقڵ و فام؛ تارییش؛ بیر و هۆش؛ ژیریی؛ فڕ.

*
Understanding and comprehension, pondering, consciousness and rememberence, intelligence, clear - apprehension, acumen, sagacity, shrewdness, quickunderstanding. n.

**ئاوەزێ (نل / ئان)**
١. زەویی بەتەڕە شوع؛ زەوی یەك ئاوی تێدا ژیابێتەوە؛ زەویی تەڕ.
٢. ب.. (٢) ئاوەڕۆ.

*
1. Dank- ground, damp soil, wet surface (of land). c.n. adj.
2. see (2) awer'o. n. adj.

**ئاوزێر کردن (کتپ)**
ڕووکەش کردن (شت) بە ئاڵتون؛ زەرکەش کردن؛ زێرکێش کردن؛ لە زێر گرتن.

*
Gild, cover with gold, overlay with gold, spread gold over, coat with gold, overly with a thin layer of gold. vt.

**ئاوەژوو (ن / ئان / ئاك)**
ئـاوژێ؛ ئاواژ؛ بـەرەواژ؛ بـەرواژی؛ بەرئاوەژوو؛ بەراوەژوو؛ واژی؛ تەلەواژی؛ بـەرویشت؛ بـاشبـوكی؛ پێچـەوانـە؛ هەڵگەڕاوەوە؛ هەڵەوگێڕاو؛ وەرگێڕاو.

*
Reversed, back to front, turned back, changed to the opposite, turned inside to outside, inverted, overturned, turned about, transposed. n. adj. adv.

**(بە) ئاوەژوو (ئاك / ئد)**
بە شێوەیەکی پێچەوانە؛ بە پێچەوانەوە.

*
By contraries, in reverse, contrary to what is expected. adv. id.

**ئاوەژوو بوون (کتن)**
بـەرەواژ بـوون؛ بـەرەویشت بـوون؛ هەڵگەڕانەوە (کاڵا و جلوبەرگ...)،

*
Be turned inside to outside, become overturned, get transposed. vt.

**ئاوەژوو کردن (کتپ)**
ب. (ئاوەژوو کردنەوە).

*
see (aweju^ kirdinewe). vt.

**ئاوەژوو کردنەوە (کتپ)**
١. هەڵگێڕانەوە؛ وەرگێڕان؛ سەرەو ژێر کردنەوە.
٢. ئاوەژوو کردن؛ بەرویشت کردن.

*
1. Reverse, transpose, turn upside down, turn end for end, turn topsy - turvy. vt.
2. Overturn, overset, change to the opposite face, change to the other side. vt.

**ئاوەژنە (ن)** ٭

ئاوەشکێنە؛ ئەو کەلەبەرەی لە پشت ئاشەوە ئاوی لێوە دەشکێنرێ لە کاتێکدا ئاشەکە بخەوێنرێ (ئاشی ئاو).

Small cut in the runlet (of water- mill when out of operating). n.

**(١) ئاوەسوو (ئان)** ٭

١. سواو؛ سووراوەوە؛ لووس (شتێ) کە لە ئاودا سوورابێتەوە.

(1)1. Wornout, unruffled, smooth- surfaced, smooth, sleek, soft, glossy, glabrous, unwrinkled, polished. adj.

٢. دەباغ نەکراو (چەرم)؛ خۆش نەکراو (پێستە).

(1)2. Untanned (leather), unconverted into leather, unimpregnated with tannin. adj.

٣. ئاوەسوو؛ بێشەرم؛ چاوقایم؛ بێ چاوورِوو؛ رووسەخت؛ بێعار (خ).

(1)3. Impudent, shameless, undignified, bold-faced, brazen-faced. Met. adj.

**(٢) ئاوەسوو (ئان)** ٭

١. نەزۆك؛ نەشۆر (ئافرەت)؛ نەشوور (ئافرەت)؛ سلك نەکەر.

(2)1. Barren, unprolific, sterile, infecund, incapable of bearing offspring (woman). adj.

٢. ئەستەویر؛ ئایسە؛ قسر؛ گیانداری مێچکە کە نەزۆك بێ.

(2)2. Barren (animal), bare, sterile (animal), unproductive. adj.

٣. زرِ؛ بێوەر؛ بێ بەرهەم؛ درەختی بێبەر.

(2)3. Acarpous, unfruitful, fruitless, destitute of fruit. adj.

٤. سواو؛ بە ئاو سواو؛ بەردێ کە ئاو سوو بێتیەوە.

(2)4. water - worn (of rocks). adj.

**ئاوەکول (ن)** ٭

نەگبەتی؛ نەهاتی؛ نشێوی؛ شکەستی.

Misery, distress, wretchedness, agony, affliction, suffering, great unhappiness. n.

ئاوەکی (ئان)
١. شل؛ وەك ئاو شل.
٢. تەڕ؛ ئاولوویی.
٣. تەرا؛ تەرە؛ دابڕاو؛ دوورکەوتە؛ هەڵهاتوو؛ دوور کەوتەو تاربوو لە ڕان (ئاژەڵ).
٤. ئاوارە؛ ئاپۆرە؛ دەربەدەر؛ لانەواز.
٥. سەر لێ شێواو؛ گومرا.
٦. نائاشنا؛ ناشنا؛ بێگانە؛ بیانی؛ ها ڤی (ئان).
٧. نابەڵەد؛ نەشارەزا؛ ناشارەزا (ئان / ن).

*
1. Liquid, waterish, diluted. adj.
2. Watery, wet, moist. adj.
3. Astray, separate, segregated, parted from, withdrawn, out of the right way, had run away, at random (animal). adj.
4. Vagabond, vagrant, truant, straying, homeless, landlouping, scared away. adj.
5. Confused (mentally... etc.), distraught, without any shelter. adj.
6. Unaquainted, unknown, unheard of, strange, distant. adj.
7. Inexpert, unhandy, bungling, maladroit, without dexterity. adj. n.

ئاوەکی بوون (کتن)
ب. (ئاوەکی کەوتن).

*
see (awek'i kewtin). vi.

ئاوەکی کەوتن (کتن)
ئاوارە بوون؛ تەرا بوون؛ دابڕان.

*
Go astray, astray, turn aside, go out of the right way.

ئاوەڵان (نك)
برادەران؛ ئاواڵان؛ دۆستان.

*
Comrades, friends, intimates. n.pl.

ئاوەڵانە (ن)
مژدانە؛ خەڵات.

*
Reward, bonus, tip, gratuity, honorarium. n.

ئاوەڵکراس (نل)
دەرپێ (ئافرەت).

*
Pants, drawers, panties, trousers (female). c.n.

ئاوەڵە (ئان)
کراوە؛ کراوەوە؛ بەربەرەڵا.

*
Open, laid bare, in sight, in view, free to all, unrestricted. adj.

ئاوەڵە بوون (کتن)
ئاشکرا بوون؛ دەرکەوتن؛ پەردە (لە سەرشت) لاچوون.

*
Become visible, become perceivable, be seeable, get evident, become unhidden. vi.

ئاوەڵە کردن (کتپ)
١. ئاشکرا کردن؛ دەرخستن؛ پەردە لەسەر لابردن (شتێ) یان (نهێنی).
٢. پیشاندان؛ خستنە روو؛ هەڵماڵین.
٣. دۆزینەوە (کتپ).

*
show, indicate, point out, divulge (a secret). vt.
2. Disclose, explain, reveal, make known, make clear.
3. Discover, find out, bring to light.

ئاوەندیار (ن)
ناوەندیار (کەسێ یا میللەتێك)؛ ناوبژیکەر.

*
Mediator, arbitrator, intercessor (a person or a nation). b.

ئاوەنووس (ن / ئان)
١. ئەبەنووس؛ عەبەنووس؛ داری ئەبەنووس.
٢. رەش؛ سیا؛ سیاو؛ سیاون (ئان).
٣. لە داری ئەبەنووس دروستکراو (شت).

*
1. Ebony, diospyros ebunum. n.
2. Black, dark, inky, ebon. adj.
3. Made of ebony, ebon. adj.

ئاوەنیا (نل / ئان)
ئاویە؛ ئاویی؛ ئاویژە؛ کوڵەوەس؛ کوڵەبەس؛ کوڵەپەست؛ کوڵەبەست؛

*
Tillable (or cultivable) land watered by a stream or rain (not dry forming, crops not

ڕەپستە؛ مەزرا؛ کەرتە؛ کشتوکاڵی ئاویی؛ بەراو؛ کشتوکاڵێ بە ئاو کرابێ (واتە؛ وشکە ومرد نەبێ).

produced by dry forming). c.n. adj.

**ئاو هاتنەوە (کتن)**

ئاو فڕێدان؛ تەواو بوون؛ بوون؛ ڕەحەت بوون.

Ejaculate semen, have a sexual orgasm, come.vi.

**ئاو هەڵچنین (کتپ)**

ئاو خواردنەوە (ئاو کە بچێتە ناو شتێکەوە..)؛ ئاو هەڵمژین.

Absorb water, take in (water), suck in, imbibe, drink in. vt.

**ئاو هەڵسان (کتن)**

ئاو هەستان؛ ئاو بەرزبوونەوە.

Flow (water) overflow, flow over. vi.

**ئاو هەڵگرتن (کتپ)**

ئاو هەڵکردن؛ ئاو کردنە سەر مەزرا؛ ئاو ڕاکێشان؛ ئاو وەرگرتن لە ڕووبار...؛ ئاو کردنە سەر شوێنێ بۆ ئاودانی کشتوکاڵ؛ ئاو ڕاکێشان لە جۆگایەکەوە بۆ سەر کشتوکاڵ.

Water land, water fields, water a land by a stream, water plants... etc., draw off water from stream to water fields. vt.

**ئاو هەڵێنجان (کتپ)**

ئاو هەڵێنجان؛ ئاو (لە بیر... تاد) دەرهێنان؛ ئاو سەرخستن (بە سەتڵ....)؛ ئاو لە بیر سەرخستن.

Draw up water, lift up (water), pull up water, (in bucket.... etc.), haul up water from well. vt.

**ئاو هێنانەوە (کتپ کتن)**

١. ڕەحەت کردن؛ خۆرە حەت کردن.

1. Engage in auto-erotism (i.e.self- abuse or onanism). vi.

٢. دەسپەڕ کردن (کتن)

2. Masturbate, mastuprate. vi.

**ئاوی بێ لغاو خواردنەوە (ئد)**

١. ئیشی سەربەخۆ کردن؛ گوێ بەکەس نەدان؛ کار بە ئارەزووی خۆکردن؛ سڵ لە کەس نەکردنەوە.

٢. بە یەکێك دەوترێ کە (بێ ئابروو؛ چەرداوەروو؛ ڕوو هەڵماڵراو) بێت و بە ئەو شێوەیە ئەریت بکات.

*

1. Drink water unbridledly. id. T.Lit. said of persons: be unconventional, behave unconstrainedly, have no shame, have no podency (bashfulness or repentence) be impudent, act freely in a work.

2. Said of (barefaced, brash, presumptuous) persons who behave suchlike.

**ئاوی بێ مەرگیی (نل)**

ب. (ئاوی حەیات).

*

see (awi^ heyat). c.n.

**ئاوی پیاو (نل)**

شەهوەت؛ شاوەت؛ تۆو؛ تۆم؛ گونەزا.

*

Sperm, spermatozon, semen, seed, the male generative fluid. c.n.

**ئاوی چاو (نل / خ)**

فرمێسك؛ ڕۆندك؛ ڕۆنتك؛ ڕندك؛ هوورمیس؛ هەڵسی؛ ئەسر؛ ئەسرین؛ ئەستیر.

*

Tears, drops of tear. n.

**ئاوی چاو دان (کتپ / ئد)**

زاخاوی چاو دان؛ چاو زاخاو دان؛ چاوبازی کردن و تەماشای ئافرەتی جوان کردن؛ ڕوون کردنەوە وچاو زاخاودان بە تەماشای ئافرەت یا شتی جوان.

*

Refresh one's eyes, give fresh vigor to one's eyes, catch the eye, catch sight of a fair sex to attract her attention so as to cool one's eyes. vt. id.

**ئاوی چاو داهاتن (کتن / ئد)**

بینایی کەم بوون؛ سۆمایی داهاتن؛ ئاو داهاتن (چاو)؛ چاو بەرەو کوێر بوون چوون؛ لێڵ بوون زەرەبینی چاوو هێزی بینین کز بوون.

*

Get blear-eyed, get dim-sighted, begin to get blind, be on the point of getting blind. vi. id.

ئاوی چاو سەندن (کتب / کتن / ئد)
ئاوی چاوداێ؛ ئاوی چاو سەنن؛ ئاوی زاردان؛ ئاوی دەم دان؛ ترساندن؛ ترس نـانەبـەر (کـەسێ)؛ تـرس خستنـە دڵ (کـەسیکەوە)؛ بـزدانـدن؛ زراو بـردن؛ ترسانن؛ تۆقاندن؛ تۆقانن.

*
Frighten, affright, startle, scare, terrify, terrorize, affray, dismay, stampede, appall, intimidate, daunt, shock with sudden fear, fill with sudden terror, strike fear into, drive off by frightening, take sudden fright. vt. vi. id.

ئاوی حەیات (نل / خ)
ئاوی بێ مەرگیی؛ ئاوی ژین؛ ئاوێکی ئەفسانەیە، گوایا هەر کەسێك لێی بخواتەوە هەر بە گەنجی و خوش تەندروست دەمێنێتەوە و نەمر دەبێ؛ ئاوێکی ئەفسانەیە گوایا هەرکەس لێی بخواتەوە هەرگیز نامرێ.

*
The water of life, the fountain of life, fountain of youth, a legendary spring supposed to restore the health and youth of anyone who drank from it and will live to enternity, a fabulous water from which one drinks will live to eternity. c.n. Met. T.

ئاوی دەم (نل / خ)
لیك؛ لیکاو؛ تف.

*
Spittle, spawl, sputum, saliva. c.n. Met.

ئاوی راوەستاوە! (ئد)
١. دەڵێی ئاوێکەو لەشوێنی خۆی پەنگی خواردوتەوە (کەسێ)؛ هەرکەسێك لەیەك جێگەدا زۆر مایەوە، وەرزدەبێ؛ ئاو کە لە شوێنێکدا مایەوە بۆگەن دەکات.
٢. بەشتێکی (بۆگەن؛ گەنیو؛ گەند؛ گەندەڵ) دەوترێ [ئد]

*
1. He is like staying water i.e. water staying (long) in one place becomes putrid (caution against long periods of service in any one place). id.
2. Used of s.th. (smelling bad, smelling ill, emitting a stench). id.

**ئاوی ڕژاو گرد نابێتەوە (پن)**

١. ئاوی لێژان گرد نابێتەوە؛ شتێ کە لە دەس چوو وەکو خۆی لێ ناکرێتەوە.

٢. وەکو خۆی لێ ناکرێتەوە (چۆنیەتیی شت...) (ئد).

٣. کار لە کار ترازان؛ چارە بۆ نەمان (شت)؛ چاك ناکرێتەوە.

٤. ڕاست ناکرێتەوە؛ جێی خۆی ناگرێتەوە.

٥. پینەو پەڕۆ ناکرێت.

*

1. One could not re - collect dripped water. E.E. What is done can not be undone. Pvb.
2. Can not be put back in proper - condition, can not be set in order. id.
3. To be beyond cure, be beyond reparation or relief, can not be regulated. id.
4. (it) Can not be put right, can not be put to rights, can not be set to rights. id.
5. Be beyond amendment. id.

**ئاوی ڕەش (نخ)**

١. ئاوی چاو کە دایەت.

٢. ئیشی نارەوا؛ کرداری نالەبار؛ تاوانی نالەبار؛ تاوانی گەورە.

*

1. Glaucoma. c. n. / dis.
2. Big guilt, big crime, dastardly act.c. n.

**ئاوی ڕەش داهاتن (کتن/ ئد)**

ئاویڕەش پەیدا بوون لەسەر چاو؛ کوێربوون، سۆمایی‌چاو داهاتن.

*

Go blind, become stone - blind, be sightless or visionless, vi., id.

**ئاوی ڕەوان (نا؛ ئان)**

١. ئاوی خواردنەو؛ ئاویپاك؛ ئاوێ کە بۆ خواردنەوە دەس ئەدات.

٢. ئاوێ کە لەبەری بڕوات (ئان)

٣. ب (ئاوی چایگە ١).

*

1. Potable water, drinkable water, water that may be drunk. c. n.
2. Flowing water, adj.

**ئاوی ڕوو تکان (ئد)**

١. ورشەو گەشەی دەموچاو نەمان(کەسێ).

٢. شەرم و شکۆ نەمان؛ ڕێز لا نەمان؛ ڕەفتار سووك بوون.

*

1. Rhet. s. to lose the brightness of ones face, to drip the water of ones face, id.
2. Be devoid of honour or self - respect, be devoid of self - esteem. ui. / id.

٣. بێ سوود؛ بوون؛ بێ کەڵك بوون.

3. Be good for nothing , be of no use , become useless , become unavailing. vi.

٤. بێ بەها بوون؛ بێ وەر بوون؛ بێ پیت و بەرەکەت بوون' (کتن).

4. Become worthless , get ineffectual , be nugatory. v. i.

**ئاوی ژین (نل)** *

ب (ئاوی حەیات).

see (awi˘ ḥeyat)— c.n.

**ئاوی ژێرکا (ن /ئان / خ)** *

١. ب. (ئاگری بن کا ٢، ٣).

1. see (agiri˘ bin ka 2, 3). n . /

٢. باڵا بستە؛ بنە مۆم؛ کورتە باڵا، کوڵە بنە (خ).

2. Short of stature , of short stature , stunted , undersized , lilliputain, squat , pygmean - Met. adj. n.

**ئاویشتن (کتپ)** *

١. ئاویتن؛ ئاوێژتن؛ ئاڤیتن؛ هاویشتن؛ هاوێژتن، هاویتن؛ توور هەڵدان؛ پەڕدان؛ فڕێدان؛ ئاوێژتن؛ ئاوێشتن؛ توور دان؛ پەرت کردن؛ هاویتن.

1. Throw , send , toss , dart , whirl , hurl , throw off , put off , lay aside , clear from , cast in a winding direction , dart , launch. vt.

٢. تێ گرتن، ئاراستە کردن (چەك) (کتپ).

2. Discharge (gun) , fire off , fling , sling. vt.

**(تێ) ئاویشتن (کتپ)** *

تێ خستن؛ تێ هاویشتن؛ تێهاوێژتن؛ تێ برین.

Inject , infix , pitch , Throw in , insert into , put in , place in. v t .

**ئاوی شێلوو (نل / ئان)** *

ئاوی لێڵ؛ ئاوی لیخن؛ قوڕاو.

Turbid - water , soiled - water , muddy water. c. n. adg.

**ئاوی قاچ داهاتن (کتن / ئد)**
١. ئاوی پێ داهاتن؛ زۆر ماندوو بوون (لەبەر زۆر بە پێوە بوون).
٢. قاچ شل بوون (لەبەر ماندوێتی یان زۆر بە پێوە ڕاوەستان).
٣. ورە بەردان؛ هیچ لە وزەدا نەمان.

*
1. Weary, jade, fag, tire out (by continued standing up). vi. id.
2. Have the feet disabled (because of exertion or because of being too much on foot). vi.
3. Lose moral courage, become unable to continue because of loss of strength or endurance vi.t.

**ئاوی گوێچکە دان (کتپ / ئد)**
١. ئامۆژگاریی کردن (لە بارەی چۆنیەتیی ئیشێك یان گوێدان بە شتێ).
٢. تەگبیرو ڕا کردن (بۆ کەسێ)؛ لەکار ئاگادار کردن؛ خەت بۆ کێشان (کتپ / ئد).
٣. ڕێکخستن؛ ساز کردن؛ سازاندن؛ بەسەر و بەر کردن؛ کۆك کردن.

*
1. Advise somebody (regarding the conduct of a business or the care of something). vt. id.
2. Plan, make plans for, mark out, chalk out, sketch out. vt. id.
3. Systematize, methodize, arrange, put into a systematic form, reduce to order. vt. id.

**ئاوی گەرم (نل)**
ئاوی کوڵاتوو؛ ئاوی لەکوڵ؛ ئاڤا کەلی.

*
Thermal water, warm or hot water, very hot water, very warm water, heated water. c.n.

**ئاویلکە (نل)**
سەرەمەرگ؛ گیانەڵلا؛ گیانەڵە.

*
Pangs of death, anguish of the soul, death-rattle, throes, agony c.n.

**ئاوی لێڵ (نل)**
ب. (ئاوی شێلوو).

*
see (awı' s'e'lu'). c.n.

**ئاوی مەنگ (نل/خ)**

١ . ئاوی قوول.

*

1. Deep waters (or water). c.n. still waters (or water).

٢ . ئارام؛ هێدی؛ پیاوی مەنگ؛ پیاوی بێ دەنگ و مات.

2. Quiet, modest, undemonstrative, silent man, one of a quiet manner, having depths of emotion. Met.

**ئاوی وابە بێڵەوە (رس)**

١ . ئاوی وابە جۆگەوە؛ ئاوی ها بە بێڵەوە؛ هەموو ئیش و کارێکی بۆ ڕایی دەبێ (یان پێ دەکرێت)؛ کارامەیە؛ بە توانایە؛ بە دەستەلاتە؛ جێی ڕێزە.

*

1. Rhet. s. Lit. His spade takes up water. i.e. He is a man of great influence (or a skilled one, an efficient man), he is able to do everything (works.... etc.), he is in a position to achieve any service, he is a respectful one.

٢ . بە یەکێکی (ساماندار؛ کۆك؛ دەوڵەمەند؛ دارا) دەوترێ [خ].

2. Used of a(wealthy, luxurious; affluent, opulent, luxuriant) one. Met.

٣ . بەتفاقە؛ بە دەوڵەتە؛ خاوەن مەڕو ماڵاتە.

3. He is possessing income- producing property, he is keeping diary cattle. id.

**ئاویە (ئان / ن)**

١ . ب. (ئاوەنیا).

*

1. see (aweniya). adj.

٢ . سواخ؛ سواغ؛ سیواخ.

2. Plaster (of mud), clay plaster, mud plaster. n.

**ئاویەدان (کتپ)**

سواغ دان؛ سواخ دان.

*

Plaster, parget, cover with plaster. vt.

**ئاویی (ئان / ن)**

١ . ئاسمانیی (ڕەنگ)؛ شینی ئاسمانیی؛ شینی کاڵ؛ کەوگ؛ لاجیوەردیی.

*

1. Sphirine, sky-coloured, bright- blue, cobalt, Azure, cerulean, amethystine, indigo, ultramarine. adj. n.

٢ . ئاڤیی؛ تەبایی؛ نەبژیی؛ گیانداری ناو ئاو (کە بە بێ ئاو نەژیی)؛ هەر گیاندارێك لە ناو ئاودابژی.

2. Watery, Aquatic . adj.n.

۳. ب. (ئاوەنیا)

3. see (aweniya). adj.

**ئاوییتە (ئان)**
ئاوێتە؛ ئامێتە؛ تێکەڵاو.

Mixed, mingled, blended, joined, associated. adj.

**ئاوییگە (ن)**
دوورگە؛ ژیراف؛ ناڤرۆ؛ نیڤرۆ؛ گەزیرە.

Island, isle, islet, reef, atoll. n.

**ئاوییەنك (ن)**
پاسەوانی؛ دیدەوانی؛ کێشکچێتی؛ کێشکڤانی.

Watch, watching, ward, watchfulness, wakefulness, vigil. n.

**ئاوێ بە جۆگەیەکا ڕۆی، ئەیێ هەر بڕوا (پن).**
هەرچی بوو، بووا؛ شتێ کە ڕوویدا ئیتر لەدەس چووە.

Water which has run downstreams does not return up-stream. Pvb.
E.E what is done can not be undone.

**ئاوێتە (ئان)**
ب. (ئاوییتە).

see (awîte). adj.

**ئاوێزە (ن)**
۱. ئاوێز؛ ئاوێزان؛ داڵوچکە؛ داڵۆچە؛ داڵۆزکە؛ داڵۆسکە؛ دارۆچکە.
۲. لالە؛ چلچرا؛ چرای هەڵواسراو.

1. Suspender, garter, binder, a hanging object. n.
2. Chandelier, candelarum, candelabra (hanging from a ceiling), luster, hanging lamp, lustre.n.

٣. كۆ؛ پیروو (ئاس).
٤. پلپلە؛ پرپرە؛ شۆڕابە

3. The plei… Alcyone, Tauri. n., Astron
4. Pendant, p…dent, hob, hobber, hanging-appendage. n.

**ئاویزەی گوارە (نل)**
پلپلەی گوارە.

*
Ear-ring pendents, ear- drop. c.n.

**ئاویژتن (کتپ)**
ب. (ئاویشتن).

*
see (awi'stin; vt.

**ئاویژە (ن)**
ئاویژەر؛ ئاویژیار؛ هاوێـژەر؛ وەشێن؛ وەشێنەر؛ (بەرد، گوللە.... تاد) هاوێژ.

*
Thrower, hurler, caster, flinger, tosser, emitter, aimer. n

**ئاوێکی خراپی ڕشتووە (رس/ئد)**
١. ئاوێکی خراپ ڕێژراوە؛ شتێکی خراپ کراوە بەباو؛ ڕەنگێکی خراپ ڕێژراوە؛ داب و دەستوورێکی خراپ هێنراوەتە کایەوە.
٢. پێشوونەیەکی گەند (گەنگە) خولقاندن.
٣. ڕێبازێکی خراپ دانان؛ بەرنامەیەکی بێ کەلك دانان.

*
1. Rhet. s. A bad routine has been brought forth into play, to put a bad habit in action (make use of it) or a bad habit has been put in action. id.
2. Make a bad precedent in a thing. id.
3. Work out a bad scheme, bring a useless programe to pass. id.

**ئاوێنە (نل)**
١. ئەیێ؛ خۆدێ؛ دروێ؛ درووف؛ ڕۆنایی؛ قۆدی؛ قۆدیك؛ قۆدك؛ نەینۆك؛ نەمینك.
جام؛ جامەك؛ قباله؛ قیبالە (ن).

*
1. Mirror, reflector, speculum, looking glass. c.n.
2. A crystal used by fortunetellers. n.

ئاوێنه ئەگرنه ڕووی (ئد)
ئاوێنه به دەمیەوە دەگرن (تا بزانن هەناسەی تێدا ماوە) بە یەکێك دەڵێن کە زۆر کەشەنگ بێت. واتە: (ئاگا لە خۆ نەماو (براو)، بێ هۆش، بێ خوست، لەهۆش خۆچوو).

*
They feel his (or her) mouth by mirror. or to feel someones' mouth by mirror. i. e to find out if one is still breathing. Used of persons and means: unconscious , not aware of ones own existence , not conscious of self , to be swooning , faintaing away , (he is in a dead faint). id. / Lit.

ئاوێنه به دەمیەوە ئەگرن (ئد)
ب. (ئاوێنه ئەگرنه ڕووی).

*
see (aw'ene egirne 'r'uy). id.

ئاوێنه بەند (ئان)
لە ئاوێنە گیراو (ژوور یا تەلار)، ژوور یا تەلارێك کە دیوارەکانی ئاوێنەی تێ گیرابێ (بۆ ئەوەی جوانتر بنوێنێ).

*
Garnished with mirrors (room or palace) , (room or inside walls of a palace) covered with mirrors (so as to look more attractive). adj.

ئاوێنەگرەوە (نل)
١. بەخت گرەوە، فاڵچیی، فاڵگرەوە، قباڵەگرەوە.

*
1. Fortuneteller , foreteller , one who fore - tells the future. c. n.

٢. باربەژنگەر، تەلەسم باز، جادووگەر.

2. Sorcerer , magician , wizard. n.

ئاه (ئسب / ن)
١. ب. (ئاخ ١ ، ٢).
٢. ئەوەندەی بڵێی یەك و دوو، چاوترووكانێك، ماوەیەكی كورت، مەودایەكی زۆر كەم، هەناسەیەك (در).
٣. هەناسەیەكی درێژ بۆ پیشاندانی (پەرۆش؛ ئاوات؛ پەشیمانی؛ جخار؛ ماندوێتی).

*
1. see (ax 1 , 2). interj.
2. A winking , wink , moment , an instant , trice , not a wink , eye - wink , point of time , twinkling , a very short while ,jiff , jiffy. meto.
3. Sigh , groan (the act or sound of sighing in expressing , hoping , sorrow , repentance , relief , fatigue... etc). n.

ئاها (ئسب؛ ئان / ئاك)
١. ب. («٢» ئاوا / ١).
٢. وشیاربه!؛ هوشیار به!؛ هۆشت بێ!؛ خۆت لادە! دوورکەوە!؛ برۆ بەولاوە؛ خەبەردار!.

*
1. See («2» awa / 1) . adj. .adv.
2. Look ! , Behold ! , take notice! , Observe! , Have notice of...! , Be mindful! Be wary! , Have guard against! , interj. p.

ئاه تیاماو (ئاه تێدا ماو) (ئانل)
زیندوو، زرپو زیندوو، نەمردوو، گیان تێداماو؛ هەناسە تیاماو.

*
Alive , in the bonds of life , in life , above ground , breathing , live , not dead. adj.

ئاه تیانەمان (کتن / ئد)
١. ئاه تێدا نەمان، ئاه تیادا نەمان؛ بەرەو نەمان رۆیشتن.
٢. مردن؛ نەمان (کتن / ئد).

*
1. Become empty of , there is no further use of (it) , the end is near for. vi./id
2. Die , expire , draw the last breath.vi. / id.

ئاه تێدا نەبوون (کتن / ئد)
برسیی بوون؛ هەست بە برسێتی کردن؛ گورچو خاڵی بوون.

*
To hunger , feel hunger , feel hungry , famish. vi. / id.

ئاه لەبەردا نەمان (کتن / ئد)
بێ هێز بوون؛ بێ تین بوون؛ تین تێدا نەمان (ـ تیا نەمان).

*
To be tired out , get exhausted , be frittered away , have run through with. vi. / id.

ئاه و نزا (ئنل)
ئاه و نزولە؛ لە خواپارانەوە؛ نەفرین.

*
Sighing convulsively , complaining and weeping , lamenting. c. n.

**ئاه و ... (نل)**
هەناسەی سارد، ناڵەناڵ، کـسکین، گالین، وەیل.

Mooning, groaning, wail, lament, plaint, complaint, complaining, creaking, lamentation.

**ئاهو نزوله (نل)**
١. ب. (ئاه ونزا).
٢. نزا؛ نیاز؛ خواز؛ پارانەوەو لالآنەوە.
٣. رِۆ رِۆ؛ کارە کار؛ گریان؛ گریە؛ گریانی سەخت؛ فیینکە؛ لاوانەوە؛ وەیشیرە.

1. See (ah u niza). c. n.
2. Invocations, supplications, conjurations, orison, petition, solicitation, request. n.
3. Mournful song, dirge, elegy, weep, moan. moaning, funeral song, lamentation. n.

**ئاهوریی (رو)**
ترموکە؛ خەرتەلە؛ خەرداله؛ گۆرمزە.

Mustard, charlock. n. Bot.

**ئاهۆ (نخ)**
١. درم؛ نەخۆشیی تەشەنەکەر.
٢. دەرد؛ ژەهریی؛ ژهرك؛ ناسازیی؛ ناساخیی؛ نەخۆشیی؛ نەساخیی؛ نەوەشیی.
٣. بوورانەوە (نەخۆشیی)؛ تەپ؛ پەرکەم؛ فێ؛ گەشکە.
٤. ئاهوو؛ زەمەداریی؛ کەم و کوریی؛ کەمایەتیی؛ کەمایەسیی (لە تەندروستیدا)؛ ناتەواویی؛ نەنگیی؛ عیللەت.
٥. خ. پ؛ گەند؛ گەندمژە؛ نالەبار (ئان / ئاك).
٦. چا، قوولکە؛ رِشانەوە؛ قران (ن/نخ).

1. Infectious disease, contagious disease.
2. Disease, disorder, distemper, illness, infirmity, indispostion, ail, ailment, complaint, malady, sickness. n.
3. Epilepsy, epileptic fit, falling- sickness. n. dise.
4. Imperfection, infirmity, defect, debility, vice, torment, unsoundness, short-coming, thorn in one's side. n.
5. Bad, badly, evil, deleterious, detrimental, deleteriously, detrimentally adj. adv.
6. Plague, pest, pestilence. n., dise.

**ئاهەك (ن)**
قسڵ.

Lime, calcium oxide, calcium carbonate. n.

**ئاه هەڵکێشان بۆ (شتێ) [کتن]**
ئاخ و داخ هەڵکێشان؛ ئاوات خواستن؛ پەشیمانیی حاسڵ کردن بۆ (شتێ).

Grieve, mourn, groan, creak, sigh for. vi.

ئەسپە ئاسنینە (ن)
پایسکل؛ دووچەرخە.

*
Iron - horse, bicycle. c.n.

ئەسپەدارینە (نل)
١. پریشقە؛ عەرەبانـە (کە بـە دەس رادەکێشرێ یا پاڵی پێوە دەنرێ).
٢. ئەسپی لە دار دروستکراو بۆ بازدان بە سەریدا لە یاری جومناستیکدا.

*
1. Cart - go,man strength - vehicle, a small wheeled carriage drawn or pulled by hand, a light hooded two - wheeled or four - wheeled carriage, drawn by one man. c.n.
2. Wooden-horse, a padded block on legs used for jumping or vaulting in gymantics, vaulting - horse, vault- horse, leap - horse. n.

ئەسپەر (ن)
١. سپێر؛ سپەر؛ سەنگەر؛ خەندەك؛ کەندەك (سپ).
٢. ئەسپەرە؛ زرێ؛ قەڵخان؛ مەرتاڵ؛ مەتاڵ.
٣. قاپیلك؛ کۆست؛ قاپیلکی کیسەڵ.

*
1. Barricade, bulwark, rampart, cover, palladium, safeguard, internchment. n, mil.
2. Shield, buckler, targe, aegis. n.
3. Carapace, tortoise- shell, the back - shield of turtle (tortoise). n.

ئەسپەرزە (ن / رو)
١. تۆوسپی؛ پاقلەی دەنك سپی؛ پاقلەی ناوك سپی؛ گیا مێشوولە؛ گێچانە.
٢. ب. (ئەسپەندەر)

*
1. Gourd - plant, worm seed (plant), endive, succory, fleawort, a plant without stem. n.; Bot.
2. see (espender). n., Bot.

ئەسپەرە (ن)
١. گێنۆ؛ گەسکە؛ زەرتك؛ گیایەکە رەنگی زەردی لێ دەردەهێنرێت.
٢. زەدرەچەوە (بەهاراتە و دەرمانیشە) [وەك مەرهەم بەکار دەهێنرێت].

*
1. Dyer's - weed, dye-weed, dyer's rocket, memecylon tinctorium, a plant from which yellow dye is made, plant of yemen used as yellow dye. n. , Bot.
2. Turmeric, saffron, kurkum (seasoning and medicine), Indian saffron (also used as liniment). n.

٣. ئەگریجە.

3. Side - tress, side - boards, side - burns, kiss - curl. n.

٤. شوێن پێی سەرکلکی بێڵ؛ دارێکی کون تێکراوە دەخرێتە کلکی بێڵەوە، بۆ ئەوەی لە کاتی زەوی کێڵاندا پێی بخرێتە سەر وهێزی بلەرێنێ.

4. Foot - rest (in a hoe or spade), foot - press of turning - over spade, a hollowedout crosspiece of wood infixed on shaft of breaking - up - spade to take constraining force of foot during cultivation of the soil, end part of the breaking - up - spade where is to take pressure of foot. n.

٥. ب (ئەسپەر / ٢).

5. see (esper / 2). n.

ئەسپەرەم (ن / رو)

ئەسپەرم؛ رێحانە؛ رێحانە؛ رێون؛ ریان؛ شاسپەرم.

*

Veronica, basil, sweet - basil, penny - royal. n., Bot.

ئەسپەرێز (ئل)

ئەسپ رەس؛ دەسەناو؛ ئەندازەیەکە کەسوارتیایدا لنگەبدات؛ ئەوجێگەیەی ئەسپی تیادا رام دەکرێ (تەعلیم دا ـ دەدرێت)؛ مەیدانی غارغارین؛ مەیدانی پێش برکێ.

*

Flat course, hippodrome, training - place for horses, racing ground, ring course, the race - course for flat races. c.n.

ئەسپەشینە (م/ن)

رەنگاڵە؛ خەنجەر باڵا؛ زەردەواڵەخۆر؛ قاژقاژە؛ کەنەسمە؛ کاسەڵەشینکە؛ هەنگ خۆرە؛ هەنگۆچنە؛ باڵندەیەکە لەسەر خواردنی هەنگ و مێروچکەی تر دەژی.

*

Bee - eater, merpos, bird that feeds on bees and other insects. n. B.

**ئەسپەك (ن)**
١ . ئەسپەنەك؛ ژانەسەر.
٢ . سووربوونەوەی پێست (بە هۆی نەخۆشی یەكەوە).

*
1. Violent head - ache (after typhus). n.
2. Eruption of the skin (because of disease). n.

**ئەسپەمار (نل)**
تیرمەمار.

*
Speckled serpent, winged serpent. c.n.

**ئەسپەناج (ن / رو)**
جاترە؛ جاترەكێویلە؛ جاترەدەشتەكی.

*
Wild thyme (Thymus serpyllum). n. , Bot.

**ئەسپەناخ (ن /رو)**
سپێناخ.

*
Spinach, spinage. n. Bot.

**ئەسپەندار (ن / رو)**
ئەسپیندار؛ سپیدار؛ سپیندار؛ سپیار؛ چنار؛ دارچنار.

*
Aspen - tree, white - poplar. n., Bot.

**ئەسپەندەر (ن / رو)**
ئەسپەند؛ ئەسپەنەر؛ سپەند؛ ئەسفەند؛ قانگە (ڕووەكێكی پزیشكی یە).

*
Rue (a medicinical plant), wild - rue, Syrian - rue. n. ; Bot.

**ئەسپەندرەی سپی (ن / رو)**
سیری زەرد.

*
yellow- garlic, peganum - harmala, sarcostema. n. Bot.

**ئەسپیان ناڵ ئەكرد، كەریش پێی هەڵبری؛ ووتی منیش؛ (پن)**
بە یەكێك دەووترێت كە لاسایی كەسێكی لە خۆی زیاتر بكاتەوە (یا خۆی لەو بە زیاتر بزانێ).

*
T. They were shoing the horse, the ass also lifted its feet. Used of one who thinks one's self worthier than another one of higher class. Pvb.

بنگ

-E.E. (a) Every ass thinks himself worthy to stand with the king's horses.

(b) A cat may look at a king.

(c) Joan is as good as my lady in the dark.

(d) It is hard to please a knave as a knight.

(١) ئەسپی باو بۆران (نل / ئان)

١. ئەسپی باو باران؛ ئەسپی بە تەوژم و خێرا؛ ئەسپی تیژ رەوت.

٢. ئەسپێکی خەیاڵی یە.

*

(1) 1. Courser, a fast - galloping horse, a swift-running horse, a graceful or spirited horse. c.n. /adj.

(1)2. A fantastical horse. n.

(٢) ئەسپی باو بۆران (نل/ ئان /ئاك / خ)

١. چنك لەسەرشان؛ زۆر بەخێرایی؛ هالیرە هالەوێ...

٢. بەخێرایی؛ بە تاو؛ بە گوژم (ئاك / خ).

٣. چك؛ خۆشرەو؛ خۆشرۆ؛ غاردەر (ئان / ن/ خ).

٤. تاو؛ تالووکە؛ تەوژم؛ گوژم؛ گوژمە؛ هەشتاو.

*

(2)1. Hurry - scurry, helter-skelter, heels over head, with a huddling - rush. Metaph./ adv.

(2)2. Vigorously, actively, swiftly. adv. / Metaph.

(2)3. Swift- running (horse), swift (horse), war- horse, scampering, runner, pressed for time. adj. /n. Metaph.

(2)4. Hurry, haste, expedition, celerity, despatch, promtitude, quickness, over head and ears. adj./ n. Metaph.

ئەسپی پێغەمبەر (جج / ن)

ئەسپی پێغەمەر؛ کوللە حاجی.

*

Praying- inscet, sooth sayer, mantis, grass - hopper. n. inse.

ئەسپی چاك شوولێکی بەسە (پن)

زیر قسەیەکی بەسە (یا ئەلفێکی بەسە، ئیشارەتێکی بەسە)؛ کەسێ کەسە ئەلفێکی بەسە (باحەرفێکی بەسە).

*

T. A blood-horse needs only one stroke of the whip. i.e. A word to the wise is sufficient. or An intelligent man will understand a signal. A

(بنگه)

word is enough to the wise; Pvb.
E.E. (a) A word to the wise is enough.
its Latin: Verbum sapienti sat est.
(b) Send a wise man on an errand and say nothing to him. (c) A nod is as good as a wink to a blind horse. i.e. A word is enough for a wiseman.

ئەسپی حلود (نل)
ئەسپی رەسەن؛ ئەسپی چاك؛ عوێدە؛ کەحێلە؛ کەحێلان.

*
Blood- horse, pedigree-horse, horse of good breed, a horse of pure breed, a courser of pure stock, stallion, sire, stud-horse. c.n.

ئەسپی خۆشڕەو (ڕەوت) [نل/ئان].
ئەسپی تیژ ڕەوت؛ ئەسپی خۆشڕۆ.

*
Swift- paced horse, quick-paced horse. c.n. /adj.

ئەسپی خەساو (ن / ئان)
ئەسپی خەسێنراو؛ ئەسپی یەختە؛ یەختە.

*
Gelding, castrated gelder, gelded (horse). n. / adj.

ئەسپی خەڵاتی؛ کەس تەماشای دەم و دانی ناکات (پن)
هەرگیز ڕەخنە؛ یان نارەزایی پیشان مەدە بەرامبەر دەستودیاریی، سوپاس گوزاربە؛ بەرامبەر دەسکەوتنی بە هەرحاڵ.

*
T. One does not look a gift horse into the mouth.
i.e. Never criticise or express displeasure at a gift, be thankful that you have it at all; Pvb.

ئه‌سپیدار (ن / رو)
١. ب. (ئه‌سپه‌ندار).
٢. سپی چنار؛ په‌لَك؛ خۆجه‌لی؛ شاتان.

*
1. see (espendar). n., Bot.
2. Aspen, asp, abele, abelia, alder, popler. n.; Bot.

ئه‌سپی ده‌ریا (نل)
ئه‌سپی به‌حری؛ ئه‌سپی ڕوبار.

*
Hippopotoamus, hippocamp, sea-horse, river - horse. c.n.

ئه‌سپی ڕه‌سه‌ن (نل)
ب. (ئه‌سپی حدود).

*
see (espi hidu'd). c.n.

(ڕه‌ش) ئه‌سپین (رو/نل)
ڕه‌ش ئه‌سپیندار؛ ڕه‌شه‌چنار؛ ڕه‌شه ئه‌سپین.

*
Black- poplar, Nigra - poplar. c.n., Bot.

ئه‌سپیندار (رو / ن)
ب. (ئه‌سپه‌ندار)

*
see (espendar). cn. ; Bot.

ئه‌سپی سواری
ئه‌سپی سواربوون، ئه‌سپی زین.

*
steed, saddle-horse, c.n.

ئه‌سپی عاره‌بانه (نل)
ئه‌سپی عه‌ره‌بانه؛ ئه‌سپی ڕاکێشان؛ ئه‌سپی گالیسکه؛ بارگیر.

*
Carriage - horse, coach - horse, draft - horse. c.n.

ئه‌سپی غار غارێن (نل /ئان)
ئه‌سپی پێش برکێ؛ ئه‌سپی گرمو.

*
Race - horse,a horse trained for racing. c.n. adj.

ئه‌سپی فالّ (نل)
ئه‌سپی ئاوس کردن؛ ئه‌سپی په‌ڕین؛ ئه‌سپی تۆو؛ ماین به‌راز.

*
Stallion, blood - horse, excellent stallion (used as a stud). c.n.

**ئەسپێ (جج / ن /خ)**

١. مۆریان؛ سپێ؛ زینلەوار؛ زیندیی؛ زینلوو؛ هەشپش؛ مێرۆچکەیەکە دەچێتە لەشی ئینسان و هەندێ گیانداری خوێن گەرمەوە.

٢. ئەسپێی گەنم و جۆو برنج و ئارد... تاد؛ ئەو مشەخۆرەی لە گەنم و جۆو برنج و ئارد دەدات.

٣. گەرا؛ جۆرێك گەنەیە لە لەشی هەندێ پەڕەوەردا پەیدا دەبێ و خوێنیان دەمژێ.

٤. هیچ و پووچ؛ ناکەس؛ بێ بەها (کەسێ)؛ کەم پایە؛ نزم (ئان / خ).

*

1. Louse, insect that infests the body of man and other warm- blooded animals. n, inse.

2. Vermins that covers wheat, barley, rice and flour, weevil. n.

3. Tick, blood - sucking insects (mites) that infest birds. n.

4. Mean, contemptible (person), low plebein, vulgar, base, despicable, lousy. adj. Metaph.

**ئەسپێ تێدان (کتن)**

ئەسپیاویی بوون؛ پڕ لە ئەسپێ بوون.

*

Swarm with lice, be covered with vermin. vi.

**ئەسپێ دۆزین (کتپ)**

ئەسپێ لە خۆدۆزین؛ خۆ دۆزین؛ پاك کردنەوە لە ئەسپێ (لەش).

*

Delouse, louse. vt.

ئەسپێك بەچل ساڵی تەعلیم بدرێت، بۆ مەیدانی قیامەت بەکار دێت (پن)

پیر نایەوێت ڕوو بەڕووی گۆڕان و تەرزە نوێ بێت.

*

T. The horse that they try to break when it is forty years old will be fit for the race - course of the Resurrection.

i.e. Old people do not like to be confronted with change and innovations, Pvb. E.E. It is no use teaching an old dog new tricks.

ئەسپیٚ لێدان (کتپ)

١. ب. (ئەسپیٚ تێدان).

٢. ئەسپیٚ (لە ڕووەك) دان؛ ئەسپیٚ تێدان (لە ڕووەك).

*

1. see (espe´ te´ dan). vt.

2. Be black - spotted (plant). vt.

ئەسپێکی لەڕ، لە تەویلەیەکی پڕ لە کەر چاکترە (پن)

شتێکی باشی بێ ئموو، لە چەندان شتی خراپ چاکترە.

*

T. A horse, though, slim, is worth more than a stable of asses; Pvb.

i.e. A good thing, though trifle, is far better than dozens of bad things.

ئەسپیٚ‌وون (ئان / خ)

١. ئەسپیٚ تێداو؛ ئەسپیٚ هەڵهێناو (گیاندار بێ یا دانەوێڵە)؛ کەسیٚ لەشی زۆر ئەسپیٚ هەڵهێنابێ.

٢. پیس (کەسێ)؛ چەپەڵ؛ چڵکن (ئان / خ).

*

1. Lousy, infested with lice (organisms or plants). adj.

2. Dirty, disgusting, foul, filthy, nasty, unclean. adj Metaph.

ئەسپێی ئارد (نل /جر)

ئەسپێی گەنم؛ کرمەسوورە؛ کرمی دار.

*

Rust, thrips, wood-worm, red flour beetle. cn. inse.

ئەسپێی چنگی (چەنگی) گول [خ]

بەیەکێکی (بەرچاوتەنگ؛ پیسکە؛ پوولەکی؛ ڕژد؛ ڕەزیل؛ دەسگرتوو؛ دەسگرتی؛ کوند؛ گناف؛ مەنلەمۆر) دەووترێ.

*

T. As a louse in the grasp of a leprous. Used of (Ungenerous, penurious, money - grubbing, sordid, stingy, close - fisted, close, shabby, selfish, illiberal, parsimonious) person. Metaph.

ئەسپێی دەغلودان (نل)

ئەسپێی دانەوێڵە؛ ئەسپێی گەنم.

*

Mottled - corn, oscinidae. c.n.

ئەستار (ن)
تویّ؛ بەر (جل و بەرگ) ئاسەر؛ ڕووکاری ناوەوە (شت).

*
Lining, cover of the inner surface of something. n.

ئەستاندن (کتپ)
١. ساندن؛ سەندن؛ سەنن؛ بە زۆر وەرگرتن (شت).
٢. چنگ لیّ گیر کردن؛ گرتن؛ قۆستنەوە.
٣. وەرگرتن
٤. کڕین (شت)؛ سەندن (شت لە بازاڕ).
٥. داگیر کردن؛ دەس بەسەرداگرتن؛ دەست بەسەردا کێشان؛ زەوت کردن؛ ڤەگرتن.

*
1. Take, get, obtain, procure. vt.
2. Seize, grasp, grip, gripe, get hold of, clutch, clasp, lay hold of, snatch. vt.
3. Receive, come by, gain, pocket. vt.
4. Buy, purchase. vt.
5. Conquer, come upon, cause to surrender, carry off forcibly, arrest a thing forcibly, bag, fasten on, harry, plunder, pillage, rifle, ransack. vt.

(لیّ) ئەستاندن (کتپ)
لیّ ستاندن؛ لیّ سەندن؛ لیّ سەنن؛ لیّ ساندن؛ لیّداگیر کردن؛ لیّ زەوت کردن.

*
Loot, bleed, forage, fleece, free boot, maraud, rob, take a. th. from a.o. forcibly. vt.

ئەستری (ن/رو/خ)
١. دڕك؛ دڕێ؛ دڕۆ؛ زیی؛ دڕك و داڵ؛ ستری؛ پەژەڵ؛ چقڵ؛ قەڵەم؛ لاس؛ هەستری.
٢. پەژارە؛ خەم؛ ناڕەحەتیی؛ ناهەمواریی (ن/خ).

*
1. Thorn, thistle, barb, prickle, christ's thorn, spine, sharp- pointed projection, a branch or stem with a sharp point, thistle and thorny shrubs. n. Bot.
2. Scourge, nuisance, trouble, infliction, annoyance, care, bitter - pill, gall and wormwood. n. metaph.

**ئەستریك (ن)** ◆

ئەسریلك؛ چریش؛ سترك؛ سریش؛ شریز؛ شریس؛ شریش.

Glue; gum. n.

**ئەستنگ (ن)** ◆

١. چزوو (دوپشك، زەردەواڵە، هەنگ... تاد).

1. Sting (in scorpion, wasp, bee... etc.).n.

٢. پلە؛ پلیكان؛ پێپیلكە (پەیژە).

2. Roundle, rung, round (of a ladder). n.

**ئەستوور (ئاك)** ◆

١. ستوور؛ قەویی (لەپێوانەدا)؛ شتێ کەتەنك نەبێ (لەپێوانەدا).

1. Thick, not thin (in measure). adj.

٢. پاسۆق؛ فیلەتەن؛ قەبە؛ قەڵەو؛ قانج؛ کەماچ؛ گۆشتن.

2. Gross, elephantine, bulky, big, burly, stout, great, grown - big, fat, large. adj.

٣. کانە؛ کولۆفت؛ هەڤەتیی.

3. Squable, squat, stubly, chunky. adj.

٤. زۆر؛ فرە؛ مشە (خ).

4. Abundant, multitudinous, numerous. Metaph.

٥. ب. (ئاوساو).

5. see (awsaw) adj.

**ئەستووران (نل)** ◆

ریسی ئەستوور (خوریی، موو، لۆکە.. تاد)؛ خوری و لۆکەیەکە ئەستوور ریسرابێ.

Stout thread (of spun wool, goat's hair, cotton... etc. c.n.

**ئەستووران رِستن (کتپ / ئد)** ◆

١. ریسی ئەستوور رِستن (خوریی، موو، لۆکە... تاد).

1. Draw out and twist (wool, goat's hair, cotton...) into strong thread. vt.

٢. قسەی پر و پووچ کردن؛ قسەی زیادە کردن؛ قسەی ناپوخت و بێجێ کردن.

2. To utter incoherent foolish speech, talk nonsenses, babble. id.

٣. درێژەدان بە قسە؛ درێژە پێدان (بە ئاخاوتن)؛ قسەوقسەلۆك دەرهێنان؛ لە سەرشت رۆیشتن (کاتی قسە کردن).

3. Make unreasonable calls, talk volubly, make great flow of unnecessary words, speak garrulously. id.

**ئەستوورایی (ن)**
ب. (ئەستووریی).

see (estu^ri). n.

**ئەستوور بوون (کتن)**
ب. (ئاوسان ۱، ۲، ۳).

see (awsan 1, 2, 3). vi.

**ئەستورك (ن)**
ئەستوورکە؛ خەپلە؛ کولێرە؛ لەواشە؛ لەواش؛ مەزرەقە.

Round bread, loaf of bread, round cake of bread, slabs of bread (baked on pan). n.

**ئەستوور کردن (کتپ)**
١. ستوور کردن؛ قەوی کردن.
٢. با تێ کردن؛ دەماندن؛ فوو تێ کردن.
٣. بەل کردن؛ ڕەپ کردن؛ ڕەق کردن (ئامرازی نێرینە).
٤. ب. (ئاوساندن).

1. Render thick, make bulky. vt.
2. Inflate, bloat, blow up, sufflate, swell out with air. vt.
3. Harden, stiffin (said of penis). vt.
4. see (awsandin) vt.

**ئەستوورکە (ن)**
ب. (ئەستوورك).

see (estu^rk). n.

**ئەستووریی (ن)**
١. زلیی؛ زەلامیی؛ قەبەیی؛ گەورەیی (تەن).
٢. ئاوساویی؛ هەڵاوساویی؛ هەڵاوسایی؛ هەرچ بەشێ یا شوێنێکی لەش کە هەڵاوسابێ.

1. Bulk, bulkiness, bigness, elephantiness, massiveness, largeness, fatness. n.
2. Bulge, swell, a part that has been swollen, a swollen part or area of the body. n.

**ئەستوون (ن)**
١. ئەستووەند؛ ئەستووەندك؛ چەلاگە؛ ئەستوونەکە؛ ئەستوونەك؛ ئەستوونە؛ ئەستوونگە؛ ستوون؛ هەستوون؛ هەسوون؛ کۆڵەکە.
٢. پاژمر؛ پاژدمر؛ پاشلمر؛ تیرمك؛

1. Pillar, pilaster, post, pier, column, columnar mass, shaft, stanchion. n.
2. Prop, support, supporter, maintainer, up-

دیـبرەك؛ دوگر؛ دووگـری؛ داری بەر (چەرداخ؛ رەشماڵ یا دەوار).
holder, a pole over which tent, marquee, tepee, or pavilion is streched. n.

٣. قامیش؛ لوولە؛ لوولەك.
3. Pipe, tube, conduit, reed. n.

**ئەستوونە زێرینە (نل)**

*

پەلكەزێرینە؛ تیرەژە؛ كۆلكە زێرینـە؛ كەسكە سوور؛ هەسارە زێرینە.
Rainbow, iris. c.n.

**ئەستو (ن)**

*

١. ئەستۆك؛ ستۆ؛ ستوو؛ سـتـووكر؛ ستووكور؛ سكوورد؛ گەردن؛ مل.
1. Nape, the back of the neck. n.

٢. حەپك؛ هەوك؛ حەفك؛ ئەستووراپی مل.
2. Neck. n.

**(خستنە) ئەستۆ [ئد/كتپ]**

*

١. خستنە سەر ئەستۆ؛ كاربەسەر كەسێكدا سەپاندن؛ فەرمان (یا ئیش) پێدان بە...
1. Consign duty or work to, give mission to, give business to,put accountability on. id. vt.

٢. تاوان خستنە پاڵ كەسێ؛ تاوانبەسەر كەسێكدا سەپاندن؛ تاوان وەپاڵخستن؛ گێچەڵ پێ گێران.
2. Criminate, incriminate, accuse, arraign, call to account, bring charges against (of doing wrong or breaking the law), inform against. vt. / id.

٣. هەڵاوەسین (دەستێ كە شكاپێ یا بریندار بووبێ) بە ملدا (بە پارچە قوماشێ یا سارغێ).
3. Hang (broken or injured and bandaged hand) to the neck (by a strip of cloth, gauze.... ). vt.

٤. گەرەك كردن (فەرمان) لەسەر كەسێ [ئد].
4. Enjoin obligation on, put bounden duty upon s.o.. id.

(گرتنه) ئەستۆ [کتپ /ئد]
١. له ئەستۆ گرتن؛ وەئەستۆ گرتن؛ تێوەگلان؛ قبوڵ کردن (کاروفرمان) بۆ جێ بەجێ کردن؛ به دەستەوە گرتن (ئیش و کار)؛ خۆ تێوە گلان؛ چوونەژێربار؛ گرتنە دەس؛ وەئەستۆ گرتن.

•

1. Assume, attempt, set about, take up, enter upon, embark in, engage in, take in hand, take upon one's self, take on one's shoulder. vt. id.

٢. بەڵێن دان؛ پەیمان دان؛ پەیمانبەستن؛ خۆ بەستنەوە به پەیمانێ.

2. Pledge one's self, pledge one's word, pass one's word, plight one's word. vt. lid.

(١) (له) ئەستۆدان (کتپ / ئد).
له مل دان؛ له کەللە دان؛ سەربەڕاندن؛ سەر ژێ کرن؛ ستووکور قەتاندن.

•

(1) Decapitate a.o. behead s.o., guillotine, decollate, bring to the block, bring to the scaffold, deprive of the head. vt. / id.

(٢) (له) ئەستۆدان (کتپ/ئد)
بەراستزانین (وتە یا کردەوەی کەسێ)؛ دەس له ملدان؛ تۆباڵ به ئەستۆ کردن؛ شایەتیی بۆ دان.

(2) Confirm a.o. or a.th., assist a.o., give support to, minister to, bear witness in favour of a.o., testify to, corroborate. vt. /id.

ئەستۆخوار (ئاثل / خ)
١. ئەستۆکەچ؛ ملخوار؛ لارمل؛ مللاره (لەبەر نەخۆشییەك).

•

1. Crookednecked, having the neck deformed (because of a disease). adj.

٢. تەن نادروست؛ لەش به بار؛ ناساخ؛ نەخۆش.

2. Unhealthy unsound, indisposed, afflicted with a disease, out of health. adj.

٣. خەفەتبار؛ خەمبار (غمبار) [خ].

3. Lit Having a crooked nape. Used of person and means: wearied, disgusted, dejected, sorrowful, depressed, afflicted, heart - sore, grieved, in sorrow, (of the accasion) sad. Metaph.

٤. داماو؛ ێ شکاو؛ لێ قەوماو؛ ناتەواو.

4. In despair, broken - down, not having enough, deficient in, woe- begone, crushed. adj.

٥. بێکەس؛ به تاق و تەنیا؛ بەتەنێ تەقێ؛ تەك و تەنها؛ تاكو تەنها؛ تەنها؛ تەنیا؛ سەڵت و قوڵت.

5.Lonely, without many people, without any one, friendless, solitary, single and companionless. adj.

(لە) ئەستۆدا بوون (ئد)
بەرپرس بوون لە. . . ؛ لێ پرسراو بوون لە.

●
Be questioned of, be asked of. id.

ئەستۆ شكان (كتن / ئد)
١. نەمان؛ لەبەرچاو نەمان؛ لەناو چوون.
٢. مردن (بە تەوسەوە بە كەسێ بووترێ).

●
1. Cease to be, be missed, be lost to view, come to nothing. vi. /id.
2. (disparagingly and ironically) Die, be heard of no more. id.

ئەستۆ شكان (كتن / كتپ)
١. رۆیشتن (بە تەوسەوە بە كەسێ دەوترێ).
٢. زیان پێدان؛ زیان پێ گەیاندن؛ زیان گەیاندن بە (خۆ یا كەسێ).

●
1. (ironically) To leave, leave off. vi.
2. Harm (one's self or others) in some way, cause injury to, hurt, harm, scathe, do harm to (one's self or others). vt./ id.

(دەس لە) ئەستۆ كردن (كتپ/كتن/ئد)
١. ب. (ئاشت كردنەوە).
٢. ب. (ئاشت بوونەوە).
٣. موو بە بەیندا نەچوون؛ ژیانبردنەسەر بە یەكەوە (چۆن هاورێ)؛ بوون بەهاورێی یەكتر (كتن / ئد).

●
1. see (a'st kirdinewe). id. /vt.
2. see (a'st bunewe). vi.
3. Entertain friendly relations with a.o., rely upon one another, live like friends, be hand and glove, become well acquainted, be friend. vi. id.

ئەستۆی (یانملی) شكاند [كتن/كتپ/ئد]
بۆ یەكێكی چارەگران بەكار دەرهێنرێ، بە واتا: ـ
١. وەلبوو؛ رۆیشت.
٢. رۆیشت بە رێی خۆیەوە.
٣. لە ناو بردن؛ فەوتاندن؛ نەهێشتن (شت یا

●
Used of an undesirable person. Lit. He has had his nape broken. ∵
1. Has turned away from, has shun away (set out).
2. Has made his way, turned back, gone away. vi.
3. Reduce to nothing, dawdle away, idle away.

کەسێ) [کتب].
vt.

٤. تووش کردن؛ تێوە گلاندن (کتب).
4. Hurl. a.o. down into an abyss, involve a.o. in (a difficult case), embark a.o. in (a difficult affair). vt.

٥. ڕێ لێ گوم کردن؛ چەواشە کردن؛ لە خشتە بردن؛ هەڵدان.
5. Fool away, make a fool of, stray from the right path, lead astray, mislead. vt. /id.

(لە) ئەستۆی ئەودایە (ئد)
●
لە ئەستۆی ویە؛ لەسەرشانی ئەوە.
It is the reponsibility of.., be responsible for, take upon the shoulder, assume the burden of, carry upon the shoulder. id.

ئەستێرك (نل)
●
١. ئەستێرکە؛ ئەستێر؛ ئەستێرك؛ پەنگاو؛ ئەستێروك؛ ئەستێل؛ هەستێل.
1. Basin, cistern, collection of standing water, puddle, plash, pond, reservoir, stand pipe, magazine, tank.

٢. گۆل؛ گۆلاو؛ گۆلتك.
2. Mere, loch, tarn, watering - trough. c.n.

٣. بیر.
3. Well, well - head, well - spring. n.

ئەستێر (ن)
●
١. ب. (ئەستێرك / ١).
1. see (est´erk /1) .n.

٢. جۆگە؛ جۆگەلە؛ ڕفکە؛ مەهسەر.
2. Canal, channal, runnel, water - way. n.

٣. ب. (ئەسر / ١).
3. see (esir / 1). n.

ئەستێرە (ن/خ)
●
١. ئەختەر؛ ئاسارە؛ چتارە؛ ستێر؛ ستێرك؛ ستارە؛ هەسارە.
1. Star, heavenly body, luminary.n.

٢. پێنج گۆشە؛ ئەستێروك؛ پێنج چوكلە.
2. Pentagram, Asterisk, pentacle. n.

٣. بەخت؛ بەهرە؛ بەش؛ چارە؛ چارەنووس؛ هات.
3. Fortune, godsend, part, luck, destiny, fate, portion, doom, contingency, lot, blessing, fortuity; hap, piece of good luck. n. Metaph.

**ئەستێرە ژمێر (ئل)**

١. ئەختەر ناس؛ ئەختەر ژمێر؛ ئەستێرە شناس؛ نجومگەر؛ هەسارە ژمێر؛ ئەو کەسەی زانیاریی لەسەر ئەستێرەکان هەیە، یان پیشەی ئەستێرە ناسی‌یە.

٢. مووروی ئەستێرە ژمێر (بەردێکی سوورکارە و لەدۆخی کریستاڵدایە و وەك بەردێکی بەنرخ بەکار دەهێنرێ و درەوشەدارە).

●

1. Astrologer, astrol, astronomer, astrological, a person who studies or practices astrology. c.n.

2. A red stone in crystalline form used as a gem and has brilliance. n.

**ئەستێرەناس (ئل)**

ب. (ئەستێرەژمێر / ١).

●

see (est´ere jim´er / 1). n.

**ئەستێرە هەرچەند پرشنگدار بێ، بە مانگ نابێ (رس)**

بۆ بەراورد کردنی بەهرەمەندێ بەکاردێت لەگەڵ یەکێکی دیکەی لە ئەو بەهرەمەندتر.

Rhet.s. T. A shining (or twinkling) star can not be compared to (lit. will not become) the moon. Used of a person. It can refer to a mental process, e.g. seeing through a problem or situation. i.e. of a person's personality less splended than one's competitor.

**ئەستێرەی بەخت (ئل / ئاس)**

ئەستێرەی تالع لەیەکێ لەبورجەکاندا؛ ئەو ئەستێرەیەی چارەنووسی کەسێکی پێوە بەند بێ.

●

One's luck star, (in astrology) a planet, zodiacal constellation regarded as influencing human fate. c.n.; astron.

**ئەستێرەی سیوهیل (ئل / ئاس / خ)**

١. کاروان کوژە؛ ئەستێرەی بەربەیان؛ ئەستێرەیەکی بەورشەو گرشەی کەلووی کەشتی‌یە لە ئاسمانی خوارووردا دوای نیوە شەو

●

1. Astron. Canopus, Dog - star, sirius, the brightest star in southern skies, in the constellation Argo, seen in the horizon of Iraqi

سه‌ر له‌ ئاسۆی کوردستانی عێراق ده‌رده‌هێنێ.
٢. که‌م دیار؛ که‌م هاتوچۆکه‌ر؛ دره‌نگ دیار؛ که‌سێکی که‌م ببینرێت (خ/ئان).
٣. نایاب؛ دانسقه‌؛ تاك (ئان/خ).
٤. هه‌ڵبژارده‌؛ بێ هاوتا (خ).
٥. به‌نرخ؛ به‌به‌ها (خ).

Kurdistan late in the night, c.n.
2. Scarcely seen, visiting only just, one going to see people, but not so often. Met. adj.
3. Rare, scarce, singular. adj.Metaph.
4. Choice, fine, excellent, incomparable.
5. Precious, of great price, of great worth. Metaph.

ئه‌ستێره‌ی گه‌شه‌! (رس)
ئه‌ستێره‌ی به‌ختی به‌رزه‌؛ ناوچه‌وان و به‌ختی باشه‌؛ له‌برموودایه‌؛ سه‌رکه‌وتووه‌ له‌ ژیاندا.

*
Rhet. s. His star is in the ascendant (or ascendent), He is in the ascendent. i.e. Superior predominant, prevailing, prevalent, ruling, surpassing.

ئه‌ستێره‌ی له‌ ئاسماندا نه‌ماوه‌ (ئد)
بۆ که‌سێ به‌کارد ده‌هێنرێ به‌ واتای:
١. ناهومێد؛ نائومێد؛ بێ به‌هره‌؛ بێ هێڤی؛ بێ هیوا (خ).
٢. بێکه‌س؛ بێ یار و هاوده‌م؛ ته‌نها.
٣. به‌دبه‌خت؛ بێ چاره‌؛ چاره‌ڕه‌ش (ئان).
٤. کۆست که‌وتوو؛ هه‌ناسه‌ سارد (ئان/خ).

*
Used of a person and it means that a man is:
1. Ill-starred, ill - fated, unlucky, luckless, unfortunate, unhappy, hopeless. id.
2. Lonely, lone, alone, soiltary, unaccompanied, companionless, adj. metpah.
3. Unfortunate, hapless, unsuccessful, unprosperous. adj. Metap.
4. Desperate, despairing, despondent. adj. metahp.

ئه‌ستێل (ن)
ب. (ئه‌ستێرك).

*
see (este´rk). n.

ئەستێو (ن)
ئەستییو؛ ئاگرکێش؛ خاکەنـازی ئاگـر؛ کەوگیری ئاگر؛ ئامرازی دەرهێنان یان پێش کردن و خۆش‌کردنی ئاگر.

Fire- shovel, shallow flat- bladed utensil used for taking fire or tending fire - place. n.

ئەستێ و پووشو (ئل / خ)
١. بەردە ئەستێ و پووشوی دار.
٢. بۆ دوو کەس بەکار دەهێنرێ کەیەك ناگرن؛ بۆ یەك ناگونجێن؛ سروشتیان چۆن یەك نییە؛ رێك ناکەون؛ نەگونجاون(خ).
٣. دانویان بە یەکەوە ناکولێ؛ ئاگرو پووش (ئد).

1. Flint and tinder. c.n.
2. Used of two persons who are not in agreement, not fitting together, discordant, inharmonious. Metaph.
3. They are at variance, they are fire and tinder. id.

ئەستێوور (ئان) ●

١. ئەستەوییر؛ ئەستەوور؛ ستەوورە؛ نەزۆك (گیاندار، ئاژاڵ، ....)؛ سك نەكەر (ژن).
٢. بێ بەر هەم؛ بێ پیت (ئان).
٣. بێ بەر (دار درەخت)؛ بێ وەر؛ بێ حاسڵ.
٤. بێ شیر (ئا / ئان)

1. Barren (living creature, animals...) childless, incapable of bearing offspring (a woman). adj.
2. Unproductive, bare, infertile, sterile, poor. adj.
3. Acarpous, destitute of fruit. adj.
4. Bad - milker. adj.

ئەستێووڵ (ن) ●

ب (ئەستێووڵك / ٢).

see (est´ewulk /2). n.

ئەستێووڵك (نل) ●

١. ئەستێوڵك؛ ئامرازێكی موبەقە، دەمەكەی پانە بۆ ئەم دیوو ئەودیو كردنی خواردەمەنیی ناو تاوە بەكار دەهێنرێ.
٢. ب (ئەستێو).

1. Slice, spatula, kitchen implement with a flat, broad blade, used for turning food in a skillet. c.n.
2. see (est´ew). n.

ئەستێڵ (ن) ●

ب (ئەستێرك ١، ٢).

see (est´erk 1, 2). n.

ئەسر (ن) ●

١. ئەسرین؛ فرمێسك؛ ڕۆندك؛ ڕۆنتك؛ ڕنلك؛ هەڵسی؛ هۆرمیس.
٢. خەم؛ خەفەت؛ پەژارە.

1. Tear (which flows from the eye). n.
2. Sorrow, grief, worry, affliction, dolor, woe.n.

ئەسرین (ن) ●

ب (ئەسر).

see (esir). n.

(پڕ) ئەسرین (ئان / خ)
١. چاوپڕ لە ئەسرین؛ چاوپڕ لە فرمێسك؛ چاوپڕ لە گریان؛ خەمبار؛ فرمێسکاوی (چاو).
٢. چاو بە گریان؛ دڵ پڕ لە گریان (ئان /خ).

✽
1. Tearful, crying, weeping, sad, in tears, shedding tears, mournful, moudlin, ready to shed tears. adj. Metaph.
2. Tearful (eye) [man, woman], with tearful eyes, lachrymose. adj. Metaph.

ئەسکڵ (نك)
ئاگری پشکۆ؛ پشکۆ؛ پۆلوو؛ پەرەنگ؛ پۆلك؛ پەل؛ پۆل؛ پەنگری گردار؛ ئەزگە، تراد؛ سکڵ؛ سکڵ ئاگر؛ کەڵە؛ کلۆخەلوزی گەشاوەوە؛ گووزمە؛ چلۆسکە؛ چەلاسك؛ دار یان خەلۆوزی گەشاوەوە کە نەبوویێت بە خۆلەمێش.

✽
Cinders, embers, slag, scoria, brand, live coal, fire - brand, burning coal, wood or coal burned but not reduced to ashes.n. p.

ئەسکنجە (ن)
ب (ئەسکەنە).

✽
see (eskene). n.

ئەسکوێ (ن)
هەسکوو؛ هەسکە؛ هەسك؛ کەوچکێکی داری دەسك درێژە بۆ چێشت تێ وەردان و تێ کردن بەکار دێت.

✽
Ladle, a long - handled wooden spoon for mixing and dipping out food. n.

(لە هەموو دیزەیەکا) ئەسکوێیە! [رس]
خۆی تێکەڵ هەموو کارێك دەکات؛ خۆی لە هەموویشی هەڵدەقوتێنێ.

Rhet. s. lit. He serves as a wooden - laddle in every pipkin. i.e. To have a finger in every pie, to poke nose into other's affairs.

ئەسکەمل (ن)
١. کورسی؛ قەنەفە.

✽
1. Chair, seat, sofa. n.

٢ . ئەسكەملە؛ بەرزیلان؛ شێرو خەت (یاریی)؛ شێران؛ شێریاخەت.

2. Toss of coin (play), coin - tossing play (heads or tails). n.

٣ . یاری قومار؛ قومار بازیی؛ (بە دەستەیەك كاغەزی قومار دەكرێ).

3. Card-playing, a game played with a deck of cards. n.

٤ . جۆرە كورسی‌یەكی بچووكە دەتوانرێ هەردوو قاچی لەسەر دابنرێ (شوێن قاچی‌هەیە)؛ مێزی نزم.

4. Foot - stool, low - table. n.

**ئەسكەنجەبیین (ن)**

سكەنجەبین؛ سكەنگەبین؛ ئەسكەنجەمین؛ سركەو هەنگوین (شەربەت)؛ شەربەتێ لە هەنگوینی پالآوتە و سركە دروست كرابێ.

Oxymel, cooling drink of clarified honey and vinegar. n.

**ئەسكەنە (ن)**

*

١ . سكەنە؛ ئەسكەنەك؛ ئەسكەنگە؛ ئەسكنجە.

1. (Mortise) chisel, framing chisel, heading chisel. n.

٢ . بزماری پێچاوپێچ (ن).

2. Threaded - pin. n.

٣ . چەقۆی پینەچیی؛ گوێزانی پینەچیی (نل).

3. The shoe knife, cobbler's knife. c.n.

٤ . چەكوشی بەرد تاشین (نل).

4. Punching hammer. c.n.

**ئەسمەر (ئان)**

*

١ . گەنم‌ڕەنگ؛ سەوزە.

1. Dark - skinned, dark - hued, swart, swarthy, tawny, of a dark complexion. adj.

٢ . جوان؛ خوێن گەرم؛ خوێن شیرین؛ خوێن شیرن؛ ژیكەڵە؛ قشت؛ نەشمیل.

2. Beautiful, beauteous, fair, fine, handsome, comely, lovely. adj.

٣ . بۆر.

3. Brown. adj.

**ئەسووزْ (نك)**
سەوزەوات؛ تەراز؛ بنجار.

●

Greens, fresh vegetables, legume. n.pl.

**ئەشبا (ئان)**
١. بەرزتر؛ بلندتر؛ ژووروتر
٢. چاكتر؛ باشتر؛ خاستر؛ قەنجتر.
٣. قۆزتر؛ جوانتر.
٤. ئەولاتر، سەرپەر (ئان /ن).

●

1. Higher, loftier, of greater altitude., adj.
2. Better, more good, more excellent, good in a higher degree. adj.
3. More charming, lovelier. adj.
4. Extreme, extremity, outermost, most distant, most remote uttermost. adj. n.

**ئەشت (ن /نك)**
١. شت؛ شتومەك؛ شتمەك؛ تشت؛ چت؛ چتمەك؛ چشت؛ كەلوپەل؛ ئانگە؛ ئەشتەبا.
٢. بووە (گیاندار یان بێ گیان)؛ گەوهەری شتێ؛ بنەیان و بنەرەت؛ لەش؛ سفن.
٣. ئیش؛ كار.

●

1. Thing, articles, furniture, appurtenances, chattels, goods, effects, movables, commodities. n.pl. n.
2. Being (animate or inanimate), entity, body, lump of matter, lifeless substance. n.
3. Act, action, affair. n.

**ئەشك (ن)**
١. قۆڵ؛ باسك؛ پەل؛ باهوو، بازۆڵە؛ چەمپل؛ پەیك؛ بازوو.
باڵ (باڵندە).

●

1. Fore - arm, arm, anterior limb, limb, projecting part, projection, lough. n.
2. The two wings (of a bird). n.

**ئەشكنج (ن)**
بنڕان؛ پەناران؛ لاران (لە ناوەوە)؛ بێخیڕان؛ بۆشایی ئەملاوئەولای بەر (میزڵدان)؛ لۆچی لای ڕاست و چەپی گەیشتنی وورگ بە هەردوو لای ڕان.

●

Ibiac - region, cavity of groin, the fold where the abdomen joins either thigh. n.

ئەشکنجە (ن)
١ . ب (ئەشکەنجە ١، ٢).
٢ . گیره.
٣ . قولفه (ن).
٤ . چێوجەڵە (ن).

*
1. see (eškence 1, 2). n.
2. Cramp, hold - fast. n.
3. Ring, bukle, ferrel. n.
4. Band, fetter, fastener, confiner. n.

ئەشکنجە دان (کتپ)
ب (ئەشکەنجە کردن).

*
see (eškence kirdin). vt.

ئەشکنجە کێشان (کتن)
١ . تووشی ئازار و نارەحەت بـوون؛ ئەشکەنجە کێشان.
٢ . ئەشکەنجەکێشان.
٣ . ئازار چەشتن؛ ئەزیەت پێ گەیشتن.

*
1. Suffer, feel pain, smart, ache, agonize. vi.
2. Be put to inconvenience. vi.
3. Be impaired, be injured, sustain damage. vi.

ئەشکەرە (ئان)
ئاشکرا؛ دیار؛ بێ هەڵە؛ بێ چەندو چون؛ بێ گومان.

*
1. Apparent, obvious, unmistakable, indisputable, unquestionable. adj.

ئەشکەفت (ن)
ب (ئەشکەوت).

*
see (eškewt). n.

ئەشکەفته (ن / ئان)
نەشارەزا؛ ناشیی؛ شوانەوێڵە (ئان).
٢ . نەزان؛ نەخوێندەوار؛ نیازان (ئان).
٣ . شاگرد؛ سوخته؛ قوتابی (ن).

*
1. Inexperienced, undrilled, unexercised, beginner, undisciplined, raw. adj.
2. Uneducated, unschooled, unprepared. adj.
3. Apprentice, tyro or tiro, learner. n.

ئەشکەڵە (ن)
١ . ب (ئەشکەنجە / ٢).
٢ . ب (ئەشکنجە / ٣).

*
1. see (eškence / 1). n.
2. see (eškince / 3). n.

ئەشکەڵە کردن (کتپ)
١. ب (ئەشکە نجە کردن / ١، ٢، ٣).
٢. سەنگ و بەرد کردن؛ قورسایی خستنە سەر (شتێ)؛ سەنگ‌و بەرد نان.

●
1. see (eškence kirdin 1,2,3). vt.
2. Press upon. squeez out. vt.

ئەشکەنجە (ن)
١. ماووش؛ مەنگەنە؛ ئەشکەڵە.
٢. داروفەلاقە (کاری لە بنی پێ دان بە دار)؛ دارو فەلاقە (بنی هەردوو پێ)؛ بیبراز (بە کوتەك یان لیس).
٣. ئێش؛ ئازار؛ ژان.
٤. ب (ئەشکنجە / ٤).
٥. سزا (ن)

●
1. Press, roller. n.
2. Bastinado, stocks; beating (on the soles of the feet), cudgel, basting. n.
3. Ache, aching, pain, continued pain, dull pain. n.
4. see (eškince / 4) .n.
5. Punishment. n.

ئەشکەنجە کردن (کتپ)
١. فەلاقە کردن؛ داروفەلاقە کردن؛ خستنەژێر فەلاقەوە؛ ئەشکنجە کردن.
٢. ئازاردان؛ ئێش پێ گەیاندن (کتپ).
٣. هەست بریندار کردن (کەسێ)؛ ژان بردنەدڵ (کەسێ)[ئد].
٤. سزادان (کتپ).

●
1. Bastinado, cudgel, baste, beat (esp. on the soles of feet). vt.
2. Hurt, pain, give pain to. vt.
3. Wound the feelings of, give (mental) pain to . vt.
4. Punish, chastise, castigate, lash, chasten. vt.

ئەشکەنە (ن)
پیازاو؛ کاروان ئاشی؛ قەزائمە.

●
Onion soup, caravan'severy day soup. n.

ئەشکەوت (ن)
١. ئەشکەفت؛ شکەفت؛ غار؛ خار؛

●
1. Cave, cavern, den, grotto, grot.

زاخوور؛ مەرە.

٢ . گەوڕ؛ گەوڕك؛ ژڤنگ؛ کەوڕك مەڕ.

2. Sheepcot, sheepcote, sheepfold, sheep - pen. n.

**ئەشکێل (ن)**

*

١ . ئەشکیل؛ پێوەند؛ پاوەن؛ کۆت.

1. Shackle, bond, fetters. n.

٢ . هێڵی ناوەڕاست.

2. Central chord. n.

٢ . تیرە (ن).

3. Diameter, diagonal. n.

**ئەشێ خورێ و ئەشێ یەشێ (رس)**

*

دەشێ خورێ و دەشێ یەشێ؛ بە یەکێك دەووترێ کەحەز لە کردنی شتێ بکات لەبەر ئەوەی خۆی مەبەستی یەتی وبەچاك ودروستی دەزانێ، بەڵام نەیکات لەبەرئەوەی شتێکی باشتر، دروستر یا خۆشتری لا مەبەستە.

Rhet .s. F.T. He is willing, but it may hurt. i.e. a person may have a firm intention to do something because he knows it is sensible or good, but he may not do it, because he finds doing other things more enjoyable, attractive, easy, better...., etc.

**ئەشێ (دەشێ) [شر]**

*

١ . رەنگە؛ لەوانەیە.

1. Ter. It is expected that, that stands to reason.

٢ . دروستە؛ بەجێیە!.

2. It is reasonable (with appearance of truth), it is on the cards; ter.

٣ . پێویستە؛ گەرەکە؛ دەبێ؛ ئەبێ!.

3. It is necessary (that), that must be so, It can not be spared, It is inevitable, It is essential, ter.

٤ . دەتوانێ؛ بۆی هەڵدەسوورێ.

4. He is able to do (it or s.th.), He is in a position to perform it; ter.

**ئەغز (ن)**

*

١ . زەوت؛ شتێ بە زۆر داگیرکراو.

1. Catch or haul of s.th., act of taking away a. th., ravishment, abduction, thing taken forcibly. n.

٢ . کاری بردنی شتێ کەسێ بۆ خۆ بێ رەزامەندیی خاوەنی.

2. Plunder, rapine, rapacity. n.

(به) ئەغز بردن (کتپ)

زەوت کردن؛ دەس بەسەر ماڵی خەڵکدا گرتن؛ شت بۆ خۆ بردن بێ رەزامەندیی خاوەنی.

*

Ravish, strip, abduct, take away a.th., take away a. th. without approval. vt.

ئەغزە (ن)

١. فلتەری جگەرە.

٢. ب (ئاغزە).

*

1. Filter tip. n.

2. see (axze). n.

ئەغیار (ن / ئان)

١. دوژمن؛ ناحەز.

٢. غەریبە؛ بێگانە؛ خەڵقی دەرەوەی وڵات؛ خەڵقی دوور وڵات؛ بەرانیی.

٣. وریا؛ ئاگا؛ بەئاگا؛ ئاگادار؛ لەسەرخۆ؛ وشیار.

*

1. Enemy, adversary, foe, foeman. n.

2. A person living in a country not his own, strange, stranger, foreign, foreigner, outlandish, remote, unnative, distant, outsider. n. adj.

3. Cognizant, percipient, aware, mindful, adroit. adj. n.

ئەفچکاندن (کتپ)

١. شکاندن؛ راکشاندن.

٢. بەزاندن؛ راوەدوو نان (دوژمن).

٣. کاول کردن؛ وێران کردن؛ رووخاندن؛ تێکدان.

*

1. Break, smash, dash to pieces. vt.

2. Deafeat, overcome, overthrow, checkmate. vt.

3. Ruin, destroy, demolish, devastate, lay waste. vt.

ئەفسانە (ن)

١. داستان؛ دەسان؛ هەقایەت؛ سەرگوزشت.

*

1. Myth, fable, by - word, tale, story (fictitious), parable, apologue, allegory, legend. n.

۲. قسەی ناراست؛ رازێك بە مەبەستی خەڵەتاندن بکرێ؛ قسەی هەڵبەستراو (خ).

2. Falsehood, forgery, fabrication, figment, coinage of the brain. Metaph.

۳. بەسەرهات و سەرگوزەشتی خەیاڵاویی (خ).

3. Events and fictitious stories, Metaph.

**ئەفسووس (ن)**

ب (ئانوو)

see (anu˚). n.

**ئەفسوون (ن)**

۱. جادوو؛ باربەژن؛ تەلیسم؛ دێوبەند.

1. Magic, enchantment, witchcraft, necromancy, thaumaturgy, voodoo. n.

۲. نێرەنگ؛ دەم بەست؛ ئەو وورتە وورتانەی جادووکەر (جادووباز) لەبن لێوەوە دەیکات.

2. Spell, incarnation, incarnating .n.

۳. حیلەو حەواڵە؛ قسەیان رەفتارێ کە پیاو لە خشتەدەبات؛ ئەتوارێك کە پیاو هەڵدە خەڵەتێنێ.

3. Black art, conjuration, diabolic art, magical art, witchery. n.

**ئەفسوونباز (ن)**

۱. ئەفسوونگەر؛ ئەفسوونکار؛ جادووباز؛ جادووگەر؛ سیحرباز.

1. Magician, conjurer, juggler, enchanter, necromancer, thaumaturgist, shaman, wizard. n.

۲. نووشتەکەر؛ خەڵك لە خشتەبەر (بە ووتەی لووس).

2. Soothsayer, sorcerer, augur, vaticinator. n.

۳. فێڵباز؛ فێلاویی؛ تەڵەکەباز (ن / ئان).

3. Tricksy, trickish, double - dealer, hocus - pous. n. ; adj.

**ئەفەرۆز (ئان)**

دەرکراو؛ دوورخراوەوە.

Exiled, expatriated, ostracized, expelled (from one's country). adj.

ئەڤەرۆز کردن (کتپ)
١ . دەرکردن؛ دوورخستنەوە (لە وڵات).
٢ . پاش گوێ خستن؛ بەلاوە نان (کەسێ)؛ پشت گـوێ خستن؛ سـبق کـردن؛ کەمتەرخەمی لێ کردن؛ گوێ پێ نەدان؛ گوێ نەدانە شتێ یان کەسێ.

1. Exile, expatriate, ostracize, expell (from one's country). vt.
2. Pay no regarad to, forsake, leave off a.th., overlook, neglect, leave on one side, pass over, leave out of view, disesteem, not care a straw for. vt.

ئەڤچەند (ئان)
١ . هەند؛ هێند؛ ئەوەند؛ ئەمەند؛ قەر؛ بارتەقا؛ بەرتەقا.
٢ . یەك؛ ئێك؛ یێك؛ یەی.
٣ . نزیك؛ رەخ.
٤ . هەندێك؛ هیندیك؛ چەندێك؛ هەنێ؛ هنگا.
٥ . کەسێ؛ یەکێ.

1. Some, more or less, a certain quantity of, certain number of. adj.
2. One, a, an, any, a certain. adj.
3. About, near. adj.
4. Several, a considerable number. adj.
5. Some people, somebody, one, some person, somone. adj.

ئەڤراختن (کتپ)
١ . پێ هەڵگوتن؛ راڤە کردن؛ پێ ناساندن (لە رووی کۆمەڵایەتی‌یەوە)؛ بە تانووپۆی چاکیی و جوانیی و ئازایەتیی کەسێکدا هەڵدان (یان چوونە خوارەوە).
٢ . هاندان؛ پاڵ پێوە نان.
٣ . هەژاندن؛ جاندن؛ بزاوتن؛ بزواندن.

1. Inform of, introduce a.o. to (socially), make known to, give notice about a. o. to, make acquainted, point out a.o's goodness, beauty, courage.... etc. vt.
2. Encourage, inspirit, animate, enhearten, hearten. vt.
3. Stimulate, incite, instigate, cheer, console. vt.

ئەڤراز (ن)
١ . هەوراز؛ سەر بەرەو ژوورکە؛ بەربژوور؛ بەرەوژوور.
٢ . دژواریی؛ ناخۆشیی (ن)

1. Acclivity, ascend, upward slope, up-hillway, steep. n.
2. Disaster, calamity, unhappiness, affliction, n,

ئەڤین (ن)
١. ب (ئۆفلاز /١، ٢، ٣، ٤).
٢. لاو؛ لاوك؛ گەنج؛ كیژۆلە؛ دەستەكچ.

1. see (oflaz/1, 2, 3, 4). n.
2. Youth, young person, youngster, lad, young men, young women, adolescent. n.

ئەقڵ (ن)
ب (ئاقڵ / ٢).

see (aqil' / 2). n.

ئەقڵ سووكیی (نل)
ئەقڵ كەمیی.

Shabbiness, little - mindedness. c.n.

ئەك! (ئسب)
١. دەك؛ هەك؛ ئەككوو (بۆ دەربڕینی بێزاریی و نارەزایی).
٢. دەی؛ ئەی (بۆ دەربڕینی خۆشیی و ڕەزامەندیی).
٣. ووشیاربە!؛ ئاگاداربە!؛ چاوكە!؛ وریابە!؛ سەیركە!.
٤. ب (ئار/١).
٥. تەفرە؛ فریو (ن).

1. Is (he, she, it)... not? [to introduce bad wishes); interj.
2. Really, in truth, verily [to introduce good wishes]; interj.
3. Be wary!, look out! see! lo;, behold!, take notice!, observe! interj.
4. see (ar/1). interj.
5. Trick, sleight, juggle, craft, antic, caper, cheat. n.

ئەگرە (ن /ئاك)
ب (ئێرە).

see (e're). n. adv.

ئەگرییجە (ن)
زوڵف؛ كەزیی؛ گێسوو؛ بسك؛ قژیلاجانگە (ئافرەت).

Tress, lock, curl, ringlet, pig tail, ear loack, kiss - curl, a woman's (or girl's) hair hanging loosely, braid or plait of hair. n.

**ئەگریجە برین (کتب / خ)**

بە پەند کردن (ئافرەت)؛ ریسوا کردن؛ شوورەیی بەسەر هێنان.

Make a bad example of (woman), stain up on, tarnish, disgrace, put out of favor, dismiss from favor, strip of honours. Metaph. vt.

**ئەگەر (ئپ / ئاك)**

١. ئەگە؛ ئەگەرکو؛ ئەگەرێکو؛ ئەر؛ ئار؛ هەگەر؛ هەگە؛ گەر.

1. If, suppose that, admitting that, allowing that, granting that, grant that. conj. adv.

٢. گریمان؛ بەڵکو؛ بەڵکم (ئپ)

2. Supposing that, on the supposition that, in case that, in either case that. conj.

٣. بەڵکی؛ بەڵکە؛ تەقوو (ئاك).

3. Perhaphs, perchance, possibly, haply, may be, it may be, as luck may have it, per adventure. adv.

٤. یا؛ یان؛ یاخو؛ ئان؛ ئارنە؛ ئەگەرنا؛ وەرنە (ئپ/ئاك).

4. Whethar, if it be the case that, if it be the fact that, either, if not, whether or not, whether or no. conj adv.

٥. کاتێ؛ کاتێك؛ وەخت؛ وەختێ؛ هەکە (ئاك)

5. When, at the time, at the time that, while, whereas, then whichtime. adv.

ئەگەر بە بریادەبوو، پشقل
بە خورما دەبوو (رس)
ئەگەر بە دووعا ئەبوو، پشقل بە خورمائەبوو؛
ئاواتە خوازیی بێ کردار،
پیاوناگەیەنێتە ئامانج؛
بریا، بریا ناچێتە گیرفانەوە؛
بریا، بریا کیسە پرناکات.
(پتگ)

*

Rhet.s. /T. If peoples prayers took effect, dung would have (come to be) dates.
i.e. One's heart's desire without any deed is not enough to reach one to one's own goal.
E.E.
a. If wishes were horses, beggars might ride.
b. Wishes can never fill a sack.
c. If wishes were thrushes, then beggars would eat birds.
d. Wishers and woulders be no good householders.

ئەگەر پشیلە لە ماڵ نەبێ، مشکان
تلی لی لیانە (پن)
بە کەسانێك دەووترێ کەسەری گەورەیان
لەلانەبێ و سوود لەو دیار نەبوونەی وەرەبگرن
و جۆرەرەفتارێك بکەن کە نەیان توانیبێ
لەکاتی ئامادە بوونی ئەودا بیکەن.

*

a) E.E. When the cat's away the mice will play. i.e. when a person in outhority is not present the others will take advantage and do things they can not do when he is there.
b) Well kens the mouse when the cat's out of the house; Pvb.

ئەگەر پێویستی کرد (ئید)
لە کاتی پێویستدا.

*

Should the occasion arise, if it is necessary. id.

ئەگەر تۆ نەبییت بە یارم، خوا ئەسازێنێ کارم
(رس)
ئەگەر تۆ پشتگیریم نەکەیت وەك برادەرێك،
خوا فریاد رەسە لە ئاسمانەوە.

*

Rhet.s. F.T. Shouldn't you aid me as a friend,
My aid from Heaven God will send.
Note.: The idiom (Xuwa esazéné karim)

means "God will arrange my own affairs".

**ئەگەر تێخستن (کتپ)**

١ . گومان خستنە سەر ووتە و باس؛ گومان لێ کردن (هەڵوێست)؛ دوو دڵی لێ کردن.

٢ . تەگەرە تێ خستن؛ تەنگوچەڵمە هێنانە بەر جێبەجێ بوونی کارێك؛ بەرهەڵست هێنانە سەر ڕێگای جێ بەجێ بوونی کارێك.

●

1. Doubt about, be scandalised at, have doubts about, hesitate to believe, consider questionable, not confide in. vt.

2. Obstruct, block up, hinder (progress, an activity, a wrok.. etc)., get in the way of performing an activity, make difficult for. v.t.

**ئەگەرچی (ئپ)**

هەرچەندە؛ هەرچی؛ هەرچەند؛ هەرچەن؛ ئارچێ؛ ئارچە؛ لەگەڵ ئەوەشدا کە...؛ لەگەڵ ڤی چەندی؛ دگەڵ ڤی هەندی؛ گەرچی؛ لەگەڵ ئەوەش؛ سەرڕای ئەوە.

●

Though, although, grant that, for all that, be it so, even if, even supposing. conj.

**ئەگەر خلە ماڵی ئەکرد، لە موڵکی خۆی گاڵی ئەکرد (رس)**

ئەگەر ئەو بتوانێت ماڵ بکات، ئەو دەمە بۆی هەیە لە موڵکی خۆیدا گاڵیش بکات.

بە یەکێك دەوترێ، کە نەتوانێ دەردێکی خۆی دەرمان بکات، ئیتر چۆن حەکیمێکە!؛ کەچەڵ دەرمانکەر بوایە، دەرمانی سەری خۆی ئەکرد.

●

Rhet.s. /T.If he wants to build a house, he can plant millet in his own land either.

F.T. If you are a digger, dig your own garden. or We must cultivate our garden, see (keĉel dermanker buaye...) i.e. We must attend to our own affairs.

E.E. Physician, heal thyself.

Note: "xile" is diminutive (noun) of "Xelil" or "Ibrahim".

ئەگەر خەوت هات سەرینت ناوێ (رس)
(ئەگەر خەوت بێ، بنوو لەسەر بەرد)؛ خەو خۆش گوێ ناداتە ئاو و هەوای ناساز؛ کەسێ کەخەوی هات گوێ ناداتە جێگەی نارەحەت.

✱

Rhet.s. Quiet sleep feels no foul weather.

E.E.

a. when troubles are few, dreams are few.

b. In sleep all passes away.

ئەگەر دەستی بڕوات، پیاو لە پشتەوە سەر ئەبڕێت (رس)
ئەگەر دەستی بڕوا لە پشتی ملەوە پیاو سەر ئەبڕێ.
١. بەیەکێکی خوێنخوار (بێ ویـژدان) دەوترێ. واتە: زۆردار؛ چەپگەر؛ خوێن مژ.
٢. خۆپەرست؛ خۆخۆ؛ خۆخۆیی کەر؛ کەسێ کەلەپێناوی سوودی خۆیدا! کۆ لە خراپە ناکاتەوە (ئان).

✱

1. Rhet. s. T. If he has authority (or capacity to rule) he would have deprived men of their heads.

Used of: an inequitable person. i.e. one destitute of equity, unfair,not fair, unjust.

2. Selfish, self seeking, egoistic, hoggish. adj.

ئەگەر رێوی بنوێ، خەو بە مریشك خواردنەوە ئەبینێ (پن).
خەیاڵ پلاو لێدان؛ خەیاڵێ خاوکردن. (بنگە).

✱

F.T. The fox dreams all night of eating fowls, Pvb.

E.E.

a. The cat dreams of mice.

b. A lover dreams of his mistress.

i.e. Spend in dreaming away, dream of, imagine as possible.

ئەگەر زانیی، ئەزم، ئەگەر نەیزانی، دزم.
(ص)
ئەگەر لە کاتی دزینی شتەکەدا جاوی پێم کەوت، ئەڵێم. ئەوەمنم؛ (واتە: بە گاڵتەمە) و ئەگەر نەشی بینیم، هەرچی شتێکم بە دەستەوە هات، خوا ناردوبەتی.

*

F.T. If he sees me steal it, I shall say "It was for a joke", but if he doesn't, what I take will be God sent; Pvb.

ئەگەر زمان بێ‌بەڵێ، سەررەحەتە (پن)
واتەکە زمانت بێتە هۆی لەمل‌دانت؛ ئەگەر قسە کردن زیوبێت، ئەوا نەکردنی‌زێڕە؛ ئەگەرئاخافتن زیڤ‌بت، نەئاخافتن زێڕە.
(رنگە)

*

Pvb. F.T. Let not your tongue cut your throat.

E.E.

a. The tongue talks at the head's cost.

b. Discourse is silver, silence is gold.

c. Silence never makes mistakes.

d. Speech is silver, silence is golden.

ئەگەر قسەی چاکیشت پێ ناگوترێ، قسەی خراپیش مەکە(پن)
(ئەگەر گوڵ نییت درکیش مەبە)؛ ئەگەر توانای چاکە کردنت نی‌یە، شوێن خراپەش مەکەوە، یان با خراپەشت لێ نەوەشێتەوە.

*

If you can not say something good, do not say anything bad, Pvb.

ئەگەر، کا، هی خۆت نی‌یە، کایەن هی خۆتە (رس)
ئەگەر خواردنەکە هی خۆت نەبێ، وورگەکە هی خۆتە.
١. بەرەورووی یەکێك دەووترێ کەزۆر خۆری بکات.

*

Rhet.s.T. The straw - bin is yours, though the straw is not. i.e. The stomach is yours, the food is your host's. Used of persons:

1. A statement against one who is over - eating.

۲. به هه‌ڵپه خواردن؛ زۆر خۆریی کردن؛ ماشینه‌وه (خواردن).
۳. گه‌ده پر کردن؛ تێ تراندن (خواردنی زۆر).

2. To gormandize, eat greedily, eat heartily, feed (take food) ravenously or excessively.
3. Stuff one's self, fill to repletion, fillfull (stomach).

ئه‌گه‌ر کوو (ئاك)
ب (ئه‌گه‌ریکو).

*
see (egere'ku). adv.

ئه‌گه‌ره‌کوو (ئاك)
ب (ئه‌گه‌رکوو).

*
see (egerku). adv.

ئه‌گین (ئاك/ئپ)
ب (ئه‌گینا).

*
see (egina). adv, conj.

ئه‌گه‌ر که‌سێك که‌سه‌، حه‌رفێکی به‌سه (پن)
(که‌سێ که‌سه‌، ئه‌لفێکی به‌سه)؛ بۆ پیاوی ئاقڵ حه‌رفێك به‌سه؛ دانا به‌یه‌ك سه‌رنج راکێشان (حه‌رفێ) له‌هه‌ڵوێست تێده‌گات و پێویست ناکات درێژه‌ی پێ بدرێت.

بنگه

*
Pvb./ F.T. A clever or wise person can understand what is meant by a hint (Lit. a word), long explanations are not neccessary for him.
or: An intelligent man will understand a signal (or word), a word is enough for a wiseman.
E.E.
a. A word to the wise is sufficient.
b. A word is enough to the wise.
c. A word to the wise is enough.

ئه‌گه‌ر گوڵ نیت، درکیش مه‌به (پن)
ب (ئه‌گه‌ر قسه‌ی چاکیشت پێ ناگوترێ. . . تاد).

*
Pvb. see (eger qisey čakišit pe' nagutre'..... ).

ئه‌گه‌ر لایلایه زانی، بۆچ ده‌م به گریانی (رس)
ب [ئه‌گه‌ر ده‌زانی (ئه‌زانی) لایلایه‌بکه‌یت. . . . . تاد.]

*
Rhet.s. see [eger dezani (ezani). laylaye bikeyt.... etc.].

ئەگەر مەڕم نەدیبێ لە هەرێزا، پشقلم دیوە لە جەرێزا (رس)

یەتە: شتێکی لێ ئەزانم.....

*

Rhet.s./ T. Though I have not seen sheep in the fields, I have at least seen dung of sheep in the cattle - shed.

i.e. I know something about it.

ئەگەرنا (ئاك/ ئب)

ب (ئەگینا).

*

see (egina). adv./ conj.

ئەگەرنە (ئاك/ئب)

ب (ئەگینا).

*

see (egina). adv. conj.

ئەگەر و نەگەر (ئاك)

دوودڵی؛ دڵە ڕاوکێ؛ ڕاڕایی.

*

Willy - nilly, shilly - shally, nolens volens. adv.

ئەگەریان چاند، سەوز نەبوو (رس)

ب (ئەگەر تێخستن).

*

Rhet.s. see (eger te´xistin).

F.T. "I wish" or "would that" was planted but did not grow. E.E.

a- A thousand wishes will never fill your pail with fishes.

b- Mere wishes are silly fishes.

c- Wishes can never fill a sack.

ئەگەر یان دا بە مەگەر، کوڕێکیان بوو ناویان نا: کاشکی! (رس)

ب (ئەگەریان چاند، سەوز نەبوو).

*

Rhet. s. see (egeryan čand, sewiz nebu). T. "If" married "Perhaps", and the offspring was "would I have not".

E.E.

a - If wishes were horses, beggars might ride.

b- If wishes were butter - cakes, beggars might bite.

(بنگە)

**ئەگەرێكو (ئپ / ئاك)**
ب (ئەگەر).

●
see (eger). conj. / adv.

**ئەگین (ئپ / ئاك)**
ب (ئەگینا).

●
see (egina). conj / adv.

**ئەگینا (ئپ/ئاك)**
ئەگین؛ ئەگەرنە؛ ئانی؛ ئانكو؛ ئەگەرنا؛ ئانگۆ؛ دەنا؛ نخۆ؛ نەخۆ؛ خۆ؛ ئارنە؛ وەرنە.

●
If nót, unless, except, besides, otherwise, less, or else, nevertheless. conj. /adv.

**ئەلالەت (ن)**
١. كۆمەڵە؛ گەل؛ هۆگە؛ گرۆ؛ كۆمەڵی پیاو؛ دەستەیەك لە مرۆیان.
٢. لیژنە؛ كۆمەڵـەیەكی رێكخـراو بۆ پرس وڕا.
٣. بەرە؛ گەڤەڵ؛ زیوە.
٤. كەرت؛ پاڵووتە.
٥. پارت.

●
1. Party, group, league, confederacy, alliance, set. clique, association. n.
2. Committee, organised group for deliberation. n.
3. Front, forepart, forward part. n.
4. Part, cue, lines. n.
5. Side, concern, faction, party. n.

**ئەلبەکی (ن)**

١. مەنجەڵ؛ مەنجۆك؛ پاتیی؛ بەڕۆش؛ سووکره.
٢. دیزە؛ گۆشی؛ دەرپۆشك (ن).

•

1. Cooking - pot (of metal), cauldron, caldron, boiler, copper. n.
2. Earthen - pot, urn, pot made of burnt clay. n.

**ئەلحەد (ن)**

١. گۆڕیچە؛ شوێنی درێژکردنی مردوو (لە بن گۆڕدا).
٢. گۆڕ؛ گڵگۆ؛ قەبر؛ مەنزڵگای هەموان.

•

1. Niche in the side of a tomb, stone lining of grave. n.
2. Tomb, urn, grave, sepulcher, sepulchre, charnel house. n.

**ئەلف (ن)**

١. یەکەم پیتی ئەلف و بێی عارەبی و چەند زمانێکی دیکەیە؛ ڤاوڵێکی بێ لایەنە.
٢. هەرشتێك ڕاست هەڵچووبێ (وەك قەدو باڵای ئافرەت...)؛ ڕاست هەڵچوو (خ / ئان).

•

1. Alpha, aleph, the first letter of the Arabic alphabet and some other languages, it is a neutral vowel. n.
2. Straight (as a stature or back), erect, upright, one being conspicuous for one's stature (especially a woman). Metaph./ adj

**ئەلفبا (ن)**

١. ئەلفبێ؛ ئەلفوبێ؛ ئەلف بێتکە؛ ئەلف بێ تێ؛ ئابێ؛ ئەلف بێتك.
٢. یەکەم هەنگاو؛ سەرەتا؛ بنەڕەت؛ ڕەچ؛ بەریێژ.

•

1. Alphabet, the A B C, letters of alphabet. n.
2. First steps, rudiments, elements (of a subject), the beginning of anything, outest, initiation, the first principles, foundation, forethought, foreknowledge. n.

ئەلف لەیلە ئەخوێنێتەوە (یان ئەخوێنێ) [ئد]
بۆ باسی یەکێك دەووترێ بە مانای:

١ . درێژە بەقسە دان؛ چەنە بازی کردن؛ زۆر بلێیی کردن؛ نەبرینەوەی قسەو لەسەر رۆیشتنی .
٢ . قسەی بێ سوود کردن؛ حەکایەتی مێش کردن .

Lit. To narrate one thousand and one night tales. Used of persons and means:
1. Talk volubly, chatter, never hear the end of it, multiply words, talk incessantly. id. vt.i.
2. Talk continually and foolishly, speak volumes (for or against s.th. or. s.o.), talk idly, have a free and foolish talk. vt. id.

ئەلف و بێ (ن)
ب. (ئەلفبا)

see (elif - ba). n.

ئەلف و بێی نە خوێندووە (رس)
١ . خوێندەوارایی نی یە.
٢ . نەزانە (کەسێ)؛ نەشارەزایە (یەکێ)؛ لە ئیش نازانێ.
٣ . هەری لە بری ناکاتەوە؛ سەرەواوی لە سکدا نی یە.

1. Rhet. s. He is uneducated (lacking education), He is ignorant, He can not read or write.
2. He is showing lack of knowledge (or education, experience..), He is inefficient.
3. He doesn't know A from B, He doesn't know his arse from his elbow, He is stupid.

ئەلووجە (ن)
ب. (ئاڵووچە).

see (alůce). n.

ئەلۆر (ئان)
بەکەڵ؛ بەتەڵەب؛ بەبا؛ فاڵ (مێچکەی ئاژاڵ).

On heat (female animal), having sexual excitement, in the period of sexual excitement (female animal), rutted, in rut, in estrus, in estrous cycle. adj.

**ئەلۆریی (ئەژ)**
سابرێن؛ تەگە؛ چتیر؛ خەزەڵ؛ نێری؛ هەوری: بزنە کێوی (نێر).

Roe - buck, goat, -buck billy- goat. n. zool.

**ئەلۆو جەلۆ (ن)**
١ . عەلۆوجەلۆ؛ هەرچی و پەرچی؛ هەرزە و هورزە؛ ئەلەو جەلەو؛ ئەلەو جەلە.
٢ . عەشامات؛ قەرەباڵغی.

1. Riff - raff, ragtag - and- bobtail, tumultuous crowd of vulgar people, dregs of the people, vulgar herd. c.n.
2. The masses, disorderly crowd, tumultous rabble, scum of society. n.

**ئەلەنگە (ن)**
زمانە بچکۆلە؛ زمانە چکۆلە.

Uvula. n.

**(بە) ئەلەنگەی نەنکییەوە!**
بەزمانە بچکۆلەی دایەگەورەیە وە؛ جنێویکی دۆستانەیە و لەبەردڵ گران نییە.

Away with the uvula of his grand- mother, what does it matter to uvula of his grand-mother!. (a friendly and an inoffensive re-viling.).

**ئەلیک (ن)**
ڕوومەت؛ گۆنە؛ گۆنا؛ لام؛ لامچی.

Cheek, either sides of the face... n.

**ئەلامەت (نخ)**
هەلامەت؛ درم؛ پەتا؛ ڤرڤینگە.

Common cold, influensa, flu, grippe. dise.

**ئەلبەتە (ئاك)**
١ . هەڵبەتە؛ بێ گومان؛ بێ درۆ؛ بەشکوو؛

1. Certainly, no doubt, truly, positively, in

ڕەنگە؛ بەڕاستی؛ ئەڵبەت؛ هەڵبەت.

fact, in reality, as a matter of fact, in truth, actually. adv.

٢. بێ چەند و چوون؛ بێ ئەملا و ئەولا (ئاك).

2. Unquestionalby, indisputably, undeniably. adv.

٣. بە ئاشكرا؛ ڕەپوڕوون (ئاك).

3. Evidently, obviously., adv.

**ئەڵقاپی (ن)** ●

دەروازە؛ دەرگای گەورە.

Large gate, town gate, gate. n.

**ئەڵقاوێز (ئان / ن)** ●

١. بەسێدارەوە كراو؛ مل بە پەتەوەكراو؛ لە سێدارەدراو؛ بە پەت هەڵواسراو؛ بە سێدارەدا كراو؛ بە پەت هەڵخراو.

1. Strangled, strangulated, throttled, choked, hanged, gibbetted, executed (by the halter), hanged by the neck. adj. /n.

٢. ئەڵقەرێز؛ ئەڵقارێز؛ ئاڵقەرێز؛ چفت.

2. Door chain, latch, sliding - latch, a fastenning for a door.

٣. ب. (ئاوێزە / ١).

3. see (awe´ze/1) .n.

**ئەڵقاوێز كردن (كتپ)** ●

١. لە سێدارە دان؛ بە دارا كردن؛ مل بە پەتا كردن؛ هەڵاوەسین؛ ئیعدام كردن.

1. Hang, execute (by the halter), hang by the neck, gibbet, truss. vt.

٢. (پەت) هەڵخستن (كتپ).

2. Hang up (a rope), suspend. a .th. to vt.

**ئەڵقە(ن)**

١. چەمبل؛ خەلەك؛ گوولی.

1. Circlet, whorl, gyre. n.

٢. چەڵمە؛ كەڵمە؛ كەڵەوە؛ خەڵتە؛ كوڵەن (ن).

2. Halter, loop, yokes collar, warper, neck - band, collarette, gorget, torque. n.

٣. چوارچێوە؛ چەمە؛ چەمەر؛ چەمەرە؛ پەراوێز؛ تار (ن).

3. Frame, framing, frame - work. n.

٤. ب. (ئاڵقە ٢، ٣، ٤).

5. see (alqe 2, 3, 4). n.

**ئەڵقە بەستن (كتپ/كتن)** ●

ب. (ئەڵقە دان).

